هەبێت هەر بەحاڵەتی پەشێوی مـەزاجی دووجەمسـەری ناودەبرێـت بەبەکارهێنانی دەرمان لـەماوەیی کـەمتر لـە (٣) مانگـدا چـاکدەبنەوە بەڵام ئەگەری سەرهەڵدانەوەی زۆرە و دەبێت چارەسەر بـەکاربهێنێت بۆ ماوەی پێویست، لەلایەن پزیشکەوە کـاتی ڕاگرتنـی دەرمـان دیـاری دەکرێت.

ئایا پێغەمبەر (د.خ) ئەم حاڵەتەی هەبووە؟

١- گرنگترین نیشانەی شادیبوون بریتیە لە خۆبەزلزانین و سـوور بوون لەسەر بۆچوونی خـۆی و بایـەخ نـەدان بـەرای بەرانبـەر دیـارە ئەمــە پێچــەوانەی تــەواوی ڕەفتارەکـانی پێغەمبــەرە کــە هەمیشــە ڕاوێژی بە هاوەڵێنی کردووە لە کاتی ئاشتی و شەردا، لەکاتی گرفتـدا بــە ڕاوێــژی یــەکێك لــە هاوســەرەکانی کێشــەکە چارەســەر دەکـات و لەکاتی جەنگدا لەسەر بۆچوونی یەکێك لە هاوەڵێن شـێواز و شـوێنی جەنگەکە دەگۆرێت.

٢-ئەوانـەی ئـەم نەخۆشـییەیان هەیـە هەڵبـەز و دابـەزی زۆر لـە ئاخاوتن و ڕەفتاریاندا هەیە و ناتوانن هیچ کـات دەوروبـەر قەناعـەت بکەن بە قسەکانیان و پاش ماوەیەکی کەم دەوروبەر دەزانن کـە قسـە و ڕەفتارەکانی ئەم کەسە جێی بـاوەر نیـە بـەڵام پێغەمبـەری ئیسـلام کە سەرەتا تەنها خۆی بانگەشەی ئەم ئایینەی دەکرد ئێستا زیـاتر لـە ملیارێك مرۆڤ هەیـە شـوێنکەوتەی ئـەم ڕێبازەیـە و ئامادەیـە ژیـان و سامانی خۆی لـە پێناویـدا ببەخشێت. (بەدرێـژایی مێـژوو هـەزارەها

کـەس هـەبوون بانگەشـەی پێغەمبـەریان کـردووە بـەڵام هـەر زوو پوچەڵی بانگەشەکەیان دەرکەوتووە شوێنکەوتەیان نەبووە و ئەوانـەی لـە سـەنتەر و نەخۆشـخانە دەرونیـەکان کـار دەکـەن سـاڵانە دەیـەها کــەس دەبیــنین کــە ئــەم نەخۆشــییەیان هەیــە و بانگەشــەی پێغەمبەرایـەتی یـان تەنانـەت خوایـەتی دەکـەن بـەڵام هـەر زوو دەوروبەر هەست بە ناتەواوی قسە و رەفتارەکانیان دەکەن).

٣-ئەوانەی کە ئەم حاڵەتـەیان هەیـە کۆنترۆڵی قسـەکانی خۆیـان پێناگرێت و گرفتی بیرکردنەومیان دەبێت بـەڵام پێغەمبـەری ئیسلام هەمیشـە هاوسـەنگ و قسـە راوەن و رەفتـار جـوان بـووە و پێشـەنگ بووە بۆ هاوەڵانی لە ئارامی و خۆراگری و سۆز و بەزەیی.

٤- بەدرێژایی مێژوو هەزارەها کەس نەخۆشـی پەشـێوی مـەزاجی دوو جەمسـەریان هـەبووە هەنـدێکیان کەسـانی نوسـەر و رۆشـنبیر و کەسانی بـەناوبانگبوون بـەڵام لەگـەڵ سـەرهەڵدانی نەخۆشـییەکەیان ئاستی داهێنانیان کەمبۆتەوە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و پیشەییەیان گرفتی گەورەی تێکەوتووە و نوسـینەکانیان تـەنها بـۆ ماوەیـەك بـری کردووە و زۆربەیان هەر لە مـاوەی ژیانیانـدا دەوروبـەر هەسـتیان بـە نەخۆشـییەکەی کـردووە، ئەمەسەدوهەشـتا پلـە پێچـەوانەی مێـژووی ژیــانی پێغەمبــەر ﴿محمــد﴾ە ﴿د.خ﴾ کــە ســەرەتا کەســێکی نەخوێنـدەوارە و پاشـان فێـری خوێنـدن دەبێـت پـاش تێپـەربوونی زیـاتر لـە(١٤٠٠) سـاڵ ژمـارەی شـوێنکەوتووان زیـاتر دەبێـت و سـاڵانە دەیـەها شـتی نـوێ لەقورئانـدا دەدۆزرێتـەوە لـە بوارەکـانی زانسـت و زمانەوانی.

٥-ژیری و مێژووی ژیانی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ هاوسەنگی لە بواری ئاخاوتن و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و پێگەی وەك سەرکردەیەك و هاوسەرێك و هاوەڵێك بۆ کەسانی دەوروبەری بەڵگەی گەورەیی و پایەبڵندی ئەم پێغەمبەرەیە.

٦-ئەم بۆچوونە شتێکی تازە نیە لەکاتی خۆیدا قورەیش و هۆزە عەرەبیەکان هەندێك ناوناتۆرەیان لە پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەنا زۆر کات بە (شێت) وەسفیان دەرد و قورئان لەزیاتر لە ئایەتێکدا باس لەوە دەکات

﴿ما أنت بنعمة ربك بمجنون﴾ (القلم ٢)

تۆ (ئەی محمد) بە نعمەتی پەروەردگار شێت نیت وەکو نەفامان دەڵێن، بەڵکو تۆ دڵسۆزی مرۆڤایەتیت و رابەر و چاوساغیانیت.

﴿فذكر فما أنت بنعمت ربك بكاهن أو مجنون﴾ (الطور ٢٩)

زیکر بکە چونکە تۆ بەهۆی نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارتەوە بەدووریت لەوەی فاڵچی بیت یان هۆش و ژیریت لەدەست دابێت.

﴿وما صاحبكم بمجنون﴾ (التكوير ٢٢)

هاوەڵەکەی ئێوە ژیری لەدەست نەداوە

﴿وقالوا يا أيها الذي نزل عليه الذكر إنك لمجنون﴾ (الحجر ٦)

ووتیان ئەی ئەوەی (محمد) کە قورئانت بۆ دابەزیوە تۆ شێتیت (هۆشت لەدەست داوە)

﴿قال إن رسولكم الذي أرسل إليكم لمجنون﴾ (الشعراء ٢٧)

فرعەون ووتی ئەو پێغەمبەرەی بۆتان نێردراوە ژیری لەدەست داوە (واتە بێباوەرانی پێشوش هەمان قسەیان بە پێغەمبەرەکانی تریش ووتوە.

﴿ويقولن آئنا تاركون آلهتنا لشاعر مجنون﴾ (الصافات ٣٦)

ووتیان ئێمە واز لە خواکەمان بێنین بۆ شاعیرێکی هۆش لەدەستچوو.

﴿ثم تولوا عنه وقالوا معلم مجنون﴾ (الدخان ١٤)

پاشان وازیا لێهێنا (پشتیان تێکردوو) ووتیان مامۆستایەکی شێتە لە کاتێکدا پێشتر پێیان دەوت راستگۆی جێمتمانە (الصادق الامین).

٧-ئەوانەی ئەم نەخۆشییەیان هەیە ( پەشێوی مەزاجی دوو جەمسەری) فرە قسە دەکەن و پارە زۆر سەرف دەکەن بەجۆرێك زیانی ئابووری گەورەیان بەردەکەوێت ناتوانن هاوسەنگی دارایی خۆیان راگرن، ئەمەش تەواو پێچەوانەی رەفتار و رێنماییەکانی پێغەمبەرە کەباس لەوە دەکات زیادەرۆیی مەکەن و و شت بەفیرۆ مەدەن و رێنماییمان دەکات بۆ هاوسەنگی دارایی.

٨-ئەوانەی ئەم حاڵەتەیان هەیە ناتوانن کەسانێکی دادپەروەر بن زۆرکات لە رەفتار و گوفتاریاندا نایەکسانی و نا دادگەری هەیە بەلام پێغەمبەری ئیسلام نمونەی کەسی دادگەر بووە لە مامەڵەی لەگەڵ هاوژین و هاوەڵێنیدا.

٩-زۆرجار ئەم نەخۆشییە بەشێوەی نەوبەی ناوبەناو دێت و کەسەکە لەماوەی تەمەنیدا زیاتر لە جارێك توش دەبێت و دواتر

نیشانەکان دیار نامێنێت بۆیە رەفتار و گوفتارەکانی تاك شپرزەی و ناهاوسەنگی گەورەی پێوەدیارە ئەمەش لە ژیانی پێغەمبەردا بووونی نیە.

١٠- بەکورتی ئەوەی برێکی کەمیش شارەزایی لە نەخۆشییە دەروونیەکان هەبێت ناوێرێت لە ناوەندە زانستیەکاندا ئەم پرۆپاگەندەیە بکات بەڵام هەندێك پەیج و کەسانی نەشارەزا هەوڵ دەدەن فریوی کەسانی نەشارەزای پێبدەن و وەك توتی هەندێك قسە دەڵێنەوە بەبێ ئەوەی بزانن مانای چیە؟ دانا باوەر ناکەم پزیشکێکی دەرونی یان شارەزایەکی بواری دەرونی بوێرێت ئەم بانگەشە بکات چونکە دەبێت راستەوخۆ گومان لەوە بکەی ئەم کەسە چۆن و لە کوێ بروانامەی بەدەست هێناوە ؟.!



**پێغەمبەری ئیسلام هەوڵی خۆکوشتنی داوە؟**

**لە فەرموودەیەکدا لە ئیمامی بوخاری دەیگێڕیتەوە کە بەکورتی باس لەوە دەکات پاش ئەوەی سروش بۆ پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دێت بۆ ماوەیەك سروشی بۆ نایەت و پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ خەمبار دەبێت و زیاتر لە جارێك دەچێتە لوتکەی بەرزی چیا بۆ ئەوەی خۆی بخاتە خوارێ بەڵام جبرەئیل پێی دەڵێت خەمبار مەبە تۆ بەراستی پێغەمبەریت بۆیە پەشیمان دەبێتەوە لە خۆکوشتن. دەقی فەرمودەکە بە عەرەبی ئەمەیە.**

**روى البخاري في الحديث رقم٦٥٨١ " من طريق عبد الرزاق قال: حدثنا معمر قال الزهري: فأخبرني عروة عن عائشة رضي الله عنها أنها قالت: أول ما بدئ به رسول الله صلى الله عليه وسلم من الوحي الرؤيا الصادقة في النوم، فكان لا يرى رؤيا إلا جاءت مثل فلق الصبح، فكان يأتي حراء فيتحنث فيه، وهو التعبد الليالي ذوات العدد، ويتزود لذلك ثم يرجع إلى خديجة فتزوده لمثلها، حتى فجئه الحق وهو في غار حراء، فجاءه الملك فيه فقال: اقرأ، فقال النبي صلى الله عليه وسلم: فقلت: ما أنا بقارئ، فأخذني فغطني حتى بلغ مني الجهد، ثم أرسلني فقال: اقرأ، فقلت: ما أنا بقارئ، فأخذني فغطني الثانية حتى بلغ مني الجهد، ثم أرسلني فقال: اقرأ، فقلت: ما أنا بقارئ، فأخذني فغطني الثالثة حتى بلغ مني الجهد، ثم أرسلني فقال: { اقرأ باسم ربك الذي خلق - حتى بلغ - علم الإنسان ما لم يعلم } . فرجع بها ترجف بوادره، حتى دخل على خديجة فقال: ( زملوني زملوني). فزملوه**



حتى ذهب عنه الروع. الحديث قال الزهري في آخره من غير سند: ﴿ وفتر الوحي فترة حتى حزن النبي صلى الله عليه وسلم، فيما بلغنا، حزنا غدا منه مرارا كي يتردى من رؤوس شواهق الجبال، فكلما أوفى بذروة جبل لكي يلقي منه نفسه تبدى له جبريل فقال: يا محمد، إنك رسول الله حقا. فيسكن لذلك جأشه وتقر نفسه فيرجع، فإذا طالت عليه فترة الوحي غدا لمثل ذلك، فإذا أوفى بذروة جبل تبدى له جبريل فقال له مثل ذلك".

بۆ وەڵامی ئەم فەرموودەیە دەبێت ئەم راستیانە بڵێین؛

١- مەرج نیە هەر فەرمودەیەك لە پەرتوكەكەی ئیمامی بوخاریدا هەبێت لە سەدا سەد راست بێت چونكە جگە لە قورئان هەموو كتێبێكی تر ئەگەری كەموكورتی هەیە و ئەگەری دەستكاری كردنی هەیە.

٢- مەرج نیە هەر فەرموودەیەك لە كتێبی ئیمامی بوخاریدا هەبێت مانای وایە ئەو بەراستی زانیبێت بەڵكو هەندێك فەرموودەی گێراوەتەوە كە سەنەدەكەی پچرانی تیایە. بۆیە ئەو فەرمودانەی سەنەدیان هەیە بەراست و دروست دادەنرێت و ئەوانەی سەنەدیان نیە یان پچران لە سەنەدیاندا هەیە رەنگە راست بن رەنگە لاواز ئەمەش یەكێكە لەو فەرمووده لاوازانە، چونكە پێچەوانەی هەندێك فەرمودە و ئایەتی قورئانیە.

٣- هەمان فەرمووده ئیمامی مسلیم گێراویەتەوە (٤٢٢) بەلام بەبێ زیادەكەی (ئیمام زوهری) لە باس لە خۆكوشتن دەكات.چونكە ئەو بەشەی زوهری هیچ سەنەدێكی نیە.

٤- باشه بۆ جبرەئیل تەنها لەو کاتەدا دەردەکەوێت کە پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ هەوڵی خۆکوشتن دەدات ئەی بۆ پێشتر نایەت کاتێک بیرۆکەکەی بۆ دێت ئایا ئەوە باشتر و شیاوتر نیە بۆ پێگەی پێغەمبەر.

٥- باشە ئەوە جارێك ئەمە رویدا بۆ چەندبارە بێتەوە ئایا پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ متمانەی بە جبرەئیل نەبووە بۆیە پێویستی کردووە هەموو جارێك جبرەئیل ئەم ووتانەی بۆ دووبارە بکاتەوە تا هێور بێتەوە.

٦- بۆ دەبێت هەموو جارێك جبرەئیل چاوەڕێ بکات تا خۆشەویست بچێتە سەر چیاکە پاشان پێی بڵێ نەکەی تۆ پێغەمبەریت باشتر نەبوو لەماڵەوە یان لە رێگا پێی بوتایە بەتایبەتی قورئان بۆ ئەوە دانەبەزیوە کە پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ توشی ماندوێتی و شەکەتی بکات. "طه": ﴿مَا أنزلنا عليكَ القُرآنَ لتشقى﴾.

٧- ئەو زیادەیەی لە فەرمودەکەیا هەیە قسەی (عائشە) نیە بەڵکو قسەی (الزوهری) خۆیەتی بەرای هەریەك لە (ابن حجر، ابوسامە المقدسی)

٨- ئەم فەرمودەیە پێچەوانەی ئەم فەرمودەیەی ترە کە راستر و دروسترە

روى الطيالسي ح١٦٨٨ وح١٦٩٣، وأحمد بن حنبل ح١٤٥٢٣ والبخاري ح٤ وح٤٦٤١، وموسليم ح٤٢٦، والترمذي ح٣٣٢٥ وغيرهم "

عن سيدنا جابر بن عبد الله أنه سمع رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: فتر الوحي عني فترة، فبينا أنا أمشي، سمعت صوتا من السماء، فرفعت بصري قبل السماء، فإذا الملك الذي جاءني بحراء الآن قاعد على كرسي بين السماء والأرض، فجئثت منه فرقا حتى هويت إلى الأرض، فجئت أهلي فقلت: زملوني زملوني زملوني، فزملوني، فأنزل الله عز وجل: {يا أيها المدثر قم فأنذر وربك فكبر وثيابك فطهر والرجز فاهجر".

**جابری كوری عبدالله دەفەرموێت گوێم لە پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ بوو دەیفەرموو بۆ ماوەیەك وەحیم بۆنەهات، كاتێك بەرێدا دەرۆیشتم گوێم لە دەنگێك بوو لە ئاسمان، چاوم بەرزكردەوە بۆ ئاسمان، ئەو فریشتەیەی لە ئەشكەوتی حراو هات بۆ لام بینیم دانیشتوە لەسەر كورسیەك لە نێوان زەوی و ئاسمان، لێی ترسام تا ئاستی كەوتن بەسەر زەویدا، هاتمەوە بۆ لای ماڵەوە پێی وتن: داپۆشن داپۆشن داپۆشن، خوای ئەم ئایەتەی دابەزاند** {یا أیها المدثر قم فأنذر وربك فكبر وثیابك فطهر والرجز فاهجر}

**لەم فەرمودەیە**

- **باس لە خەمۆكی و بیری خۆكوژی ناكات.**
- **جبرەئیل ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ ناكات بۆ ئەوەی دوو بارە پێی بڵێتەوە تۆ پێغەمبەریت تەنها خۆی نیشان دەدات.**
- **پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ بە بینینی جبرەئیل دەترسێت توشی لەرزین دەبێت نەك بۆ دڵنیایی و ئارامی بێت و بڵێیت خۆت مەكوژە.**

**• ماوەی نەهاتنە خوارەوەی سروش یەکجار بووە نەك چەند جارێك.**

**٩-ئیمامی ﴿الزهری﴾ خۆی ئەم فەرمودەیە روایەت دەكات جارێكی تر بەبێ ئەوەی باسی خۆكوشتنی تیادابێت تەنها باس لە بێتاقەتی دەكات و دەڵێت پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ بۆ بینینی جبرەئیل دەچووە سەر چیاكە.**

" أخرج الإمام عبد الرزاق في التفسير٣/٣٦٠ عن معمر عن الزهري في قوله تعالى: ﴿يا أيها المدثر﴾ قال: فتر الوحي عن النبي صلى الله عليه وسلم فترة، وقال: كان أول شيء أنزل عليه: ﴿اقرأ باسم ربك الذي خلق، خلق الإنسان من علق﴾ حتى بلغ: ﴿ما لم يعلم﴾ فلما فتر عنه الوحي، حزن حزنا، حتى جعل يغدو مرارا إلى رؤوس شواهق الجبال ليتبين خلفها، وكلما أوفى بذروة جبل تبدى له جبريل فيقول: إنك لنبي حقا، فيسكن لذلك جأشه، وترجع إليه نفسه ".

**١٠- پچرانی سەنەدی فەرمودەكە لەنێوان الزهری و پێغەمبەردا وەك دەزانین (الزوهری) لە تابعین بووە نەك لە هاوەڵانی بۆیە دەبێت كەسانێك هەبن لە روایەتەكەدا كە نین. نەك راستەوخۆ لەنێوان الزوهری و پێغەمبەر.**

**١١- زیاتر لە نوسەر و بیرمەندێك ئەم فەرمودەیەی بە لاواز ناوبردووە گرنگترینیان**

• الدكتور أكرم ضياء العمري في كتاب "السيرة النبوية الصحيحة١/١٢٦، ضعفها بالإرسال ومناقضة العصمة. الشيخ الالبانی

• الدكتور عبد الرحمن دمشقية في أحاديث يحتج بها الشيعة١/٨٦، واعتمد على الألباني.

• الدكتور علي الشحود في "المفصل في شرح آية لا إكراه في الدين"٢/٢٦٦، ردها بضعف السند، واستحالة صدورها عن المعصوم.

• الدكتور أبو شهبة في "السيرة النبوية على ضوء القرآن والسنة"١/٢٦٥.

١٢- دیاره پێغەمبەران باشترینی بونەوەرانن لەسەر زەوی و بەدوورن لە کەموکورتی رەفتاری، پاراستنی شەرعی بۆ پێغەمبەران بریتیە لە پاراستنیان لە تاوان و سەرپێچی و گوناه و شتە حەرامەکان، دیارە هەوڵی خۆکوشتن و بیری خۆکوژی کارێکی نەشیاو و خراپە و لە شەرعدا نەهی لێکراوە ﴿ولا تقتلوا أنفسكم إن الله كان بكم رحيمًا﴾ (النساء ٢٩)

١٣- لە قورئاندا خوای بەخشندە دەفەرموێت ئەوانە خوای رێنمونی کردون ئێوەش چاو لەوان بکەن ﴿أولئك الذين هدى الله فبهداهم اقتده﴾ (الأنعام ٩٠) کەواتە دەکرێت مرۆڤ لەکاتی بێزاریدا هەوڵی خۆکوژی بدات خۆ ئێمە جبرەئیل نایەت پێمان بڵێت خۆتان مەکوژن!.

١٤- لە قورئاندا لە ئایەتی (٤) سورەتی (القلم) خوای بەخشندە وەسفی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەکات بەوەی خاوەن رەفتاری بەرز و بالآیە ﴿وإنك لعلى خلق عظيم﴾ ئیتر چۆن خۆکوشتن لەگەڵ خاوەن رەفتاری بەرزو بالادا یەکدەگرێتەوە.

**١٥-	ئێوە لە پێغەمبەری خواوە پێشەنگێکی باشتان هەیە، ﴿لقدْ كانَ لكُمْ في رسُول اللهِ أُسْوةٌ حَسَنَةٌ لِمن كانَ يرْجُو اللهَ واليَوْمَ الآخِرَ وذَكَرَ اللهَ كَثِيراً﴾ (.الاحزاب ٢١) عائشەی خێزانی لە وەسفی رەفتارەکانی پێغەمبەردا دەفەرموێت (لقد كان خلقه القران) (موسلیم و بوخاری) رەفتارەکانی وەك قورئان وابون. جا چۆن دەکرێت باشترین پێشەنگ و سەرمەشقی ئێمە و هەلگری قورئان لەکاتی بێزاری و دلتەنگیدا هەوڵی خۆکوشتن بدات نەك جارێك بەڵکو زیاتر لە جارێك.**

**١٦-	پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت "انما** بعثت لاتمم مكارم الاخلاق " ( موسلیم و ئەحمەد) **بۆ ئەوە نێردراوم کە تەواوکەری رەفتارە جوانەکان بم دیارە خۆکوشتن و هەوڵدان بۆ خۆکوژی یەکێك نیە لەرەفتارە جوانەکان.**

**١٧-	ئەم فەرمودەیە بە گەلێك شێواز گێرانەوەی هەیە سەرجەم گێرانەوەکان گرفتیان هەیە لەوەی لاوازن و کەسانێك لە گێرانەوەکەیدا هەیە جێی متمانەنین و گرفتی بیرەوەریان هەیە. بۆ نمونە لەرێی(محمد بن عمر – الواقدی) گێردراوەتەوە کە فەرموودەکانی وەرناگیرێت بە بۆچوونی ئیمام بوخاری و ابن حجر.**

**١٨-	لەکۆتادا ئەم فەرموودەیە لەلایەن سێ هاوەڵەوە گێردراوەتەوە ( عقیل کوری خالید – یونسی کوری یەزید وئەلئەیلی) لە عروە لە عائشەوە کە ئیمامی (بوخاری و موسلیم) لە کتێبەکەیاندا دایان ناوە باسی خۆکوشتنی تیا نیە تەنها بەشی**

یەکەمی فەرمودەکەیە، هاوەڵی سێیەم ( معمر کوری راشد) لە عروە لە عائشەوە باس لەم زیادەیە دەکات و ئەو برە زیادەیەش نادرێتە پاڵ عائشە بەڵکو بەشێکە لە ووتەکانی (الزوهری) دیارە زوهریش لە شوێنکەوتوانە (تابعین) واتە خۆی پێغەمبەری نەدیووە دەڵێ پێمان گەیشت بەڵام نالێت کێ پێی ووتوە (ئایا ئەو کەسە کێیە؟ جێی متمانەیە یان نا) بۆیە بەو شێوازە کار بەو بەشەی فەرمودەکە ناکرێت چونکە سەرچاوەکەی دیار نیە و پێچەوانەی هەندێك فەرمووده و ئایەتی قورئانە و دابەزاندنە لە پلە و پایەی پێغەمبەر.



# بەشی چوارەم

## کەسایەتی پێغەمبەر لەرووی رەفتار و گوفتاریەوە

## پێغەمبەر لە ووتەی هەندێك نوسەر و روناکبیرەوە

## کەسایەتی پێغەمبەر لەرووی رەفتار و گوفتارەوە

گومانی تێدا نیە سەرجەم پێغەمبەران خاوەنی سیفەتی جوان و بالآن، لێرە وام بەباش زانی هەندێك لە سیما دیارەکانی رەفتاری پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ باس بکەم کە هەر کەسێك بە وویژدانەوە بروانێتە بەرزی و پیرۆزی ئەم رەفتارانە تێدەگات ئەم پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ خاوەن چ کەسایەتیەکی بەرز و هاوسەنگ و بێوێنە بووە.

### ١- دادگەری لە بریاردا:

"جاء رجل الى النبي يتقاضاه بعيرا فاغلط له في القول، فهم به اصحابه فقال النبي دعوه فان لصاحب الحق مقالا، فقالوا: يا رسول الله: لانجد الا سنا هو خير من سنه فقال اعطوه، فقال الرجل: أوفيتني أوفاك الله، فقال ان خير عباد الله أحسنهم قضاء". ( بوخاري، موسليم، أحمد)

واتە پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا داوای حەقی ووشترێکی لێدەکرد، بەقسەی رەق و ناخۆش، هاوەڵێنی وویستیان پەلاری بدەن، پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ فەرمووی وازی لێبێنن، خاوەن هەق مافی خۆیەتی قسە بکات، ووتیان، هیچ ووشترێکمان دەست ناکەوێت لەوەی خۆی باشتر نەبێت، پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ فەرمووی بیدەنێ. پیاوەکە ووتی بەوەفا بووی بەرانبەرم خوا بەفابێت بۆت، پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ فەرموی: چاکترینی بەندەکانی خوا ئەوانەن بەچاکی دادگەری دەکەن.

٢- دونیا نەویستی:

● هیچ کات خانەوادەی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ سێ ڕۆژ تێر خواردن نەبووە هەتا ئەو کاتەی وەفاتی کرد " ما أشبع ال محمد من طعام ثلاثة أيام حتى قبض" ( بوخاري و موسليم و احمد)

● عائشە (ڕەزای خوای) لێبێت دەیفەرموو پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ وەفاتی کرد و تێری نەخوارد لە نانی جۆ "خرج البني من الدنيا ولم يشبع خبز الشعير" (بوخاري).

● خانەوادەی محمد لەڕۆژێکدا دووجار نەنیان نەخواردووە ئەگەر دانەیەکیان خورما نەبوبێت " ما أكل ال محمد أكلتين في اليوم الا احداهما تمر" ( بوخاري و موسليم).

● عائشە دەڵێت: ئیمە تەماشای سەرەتای مانگمان دەکرد سێ جار لەدوو مانگدا، لەماڵەکانی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ ئاگر نەکراوەتەوە، عەروە ووتی: ئەی چۆن دەژیان، ووتی: هەردوو ڕەشەکە، خورما و ئاو. " انا لننظر الى الهلال ثلاثة اهلة في شهرين وما أوقدت في ابيات رسول الله نار، فقال عروة: ما كان يقيتكم؟ قالت الاسودان، التمر و الماءط (البخاري و المسلم و الترمذي)

● لە عائشەوە (ڕەزای خوای) لێبێت جێگەی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ لە پێستەی خوشکراو بوو ناوەخونەکەشی ریشاڵ بوو " كان فراش رسول الله من أدم وحشوه ليف" (بوخاري و موسليم و ئەبوداود و ترمزی و ئەحمد).

**• له كاتی دوعا كردندا دەیفەرموو "اللهم اجعل رزق ال محمد قوتا" (بوخاري و مسليم) واته خوایه رزقی خانەوادەی محمد ئەوەندە بێت كەپێی بژین.**

**• له عائشەی خێزانیەوە باس لەوە دەكات كە ژنێكی ئەنصار هاتە لای و بینی پێخەفی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ بریتیە لە عەبایەكی ئەستور و چووەوە بۆ ماڵەوە فەرشێكی بۆ هێنام لە خوری، كاتێك پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ ووتی: ئەمە چیە؟ پێم ووت: فلانە ژنی ئەنسار بۆی هێناوم، ووتی: بیگێرەوە بەلام من پێم جوان بوو لە ماڵەكەم بێت بۆیە نەمگێرایەوە هەتا سێجار پێی ووتم، پاشان ووتی: (ئەی عائشە بیگێرەوە بەخوا ئەگەر بمەوێت خوا چیایەكم لە ئاڵتون و زیو دەداتێ ووتی: ئەو كات منیش گێرامەوە.**

طعن زهده يروى الإمام أحمد عن عائشة رضي الله عنه قالت: دخلت علىَ امرأة من الأنصار فرأت فراش النبي صلى الله عليه وسلم عباءة مثنية فرجعت إلى منزلها فبعثت إلىَ بفراش حشوه الصوف فدخل علىَ رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال (ما هذا ؟) فقلت فلانة الأنصارية دخلت علىَ فرأت فراشك فبعثت إلىَ بهذا فقال (رديه) قالت فلم أرده وأعجبني أن يكون في بيتي حتى قال ذلك ثلاث مرات ثم قال (يا عائشة رديه فوالله لو شئت لأجرى الله معي جبال الذهب والفضة) قالت: فرددته".(أحمد)

٣-مامناوەندی له كار و عیبادەتدا:

**• چەند كەسێك لە هاوەڵێنی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ هاتنە ماڵی خێزانەكانی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ بۆ ئەوەی هەواڵی چۆنێتی عیبادەتی**

بزانن کاتێك بۆیان باسکرا ووتیان ئێمە لەکوێی پێغەمبەرین، کە خوا لە گوناهەکانی پێشتر و دواتری خۆش بووە، بۆیە بریاریاندا یەکێکیان ووتی من هەمیشە شەونوێژی دەکەم ئەوی تریان ووتی من رۆژوی بەردەوام دەگرم، ئەوی تریان ووتی من هەرگیز ژن ناهێنم، کاتێك هەواڵ گەشتەوە لای پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ ووتی ئێوە ئەمانەتان ووتوە، بەخوا من لە هەمووتان زیاتر لەخوا دەترسم و خۆپارێزی لە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی دەکەم بەلام بەرۆژو دەبم و خواردنیش دەخۆم، نوێژ دەکەم و پشوش دەدەم، ژنیش مارە دەکەم ئەوەی لە سوننەتی من لابدات لەمن نیە.

"جاء ثلاثُ رهطٍ إلى بُيوتِ أزواج النبيِّ صلى اللهُ عليه وسلم، يسألون عن عبادةِ النبيِّ صلى اللهُ عليه وسلم، فلما أُخبروا كأنهم تقالُوها، فقالوا: أين نحن من النبيِّ صلى اللهُ عليه وسلم؟ قد غفر اللهُ له ما تقدَم من ذنبه وما تأخر، قال أحدُهم: أما أنا فإني أصلي الليلَ أبدًا، وقال آخرُ: أنا أصومُ الدهرَ ولا أُفطِرُ، وقال آخرُ: أنا أعتزلُ النساءَ فلا أتزوَجُ أبدًا، فجاء رسولُ اللهِ صلى اللهُ عليه وسلم فقال: (أنتمُ الذين قلتم كذا وكذا؟ أما واللهِ إني لأخشاكم لله وأتقاكم له، لكني أصومُ وأفطِرُ، وأصلي وأرقُدُ، وأتزوَجُ النساءَ، فمَن رغِب عن سُنَتي فليس مني) "(بوخاری ومسلیم نسائی و ئەحمەد).

• پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەیفەرموو لەو کارانە بکەن کە لە تواناتاندایە چونەکە خوا بێزار و بێتاقەت نابێت هەتاکو ئێوە بێتاقەت و بێزار نەبن، خۆشەویسترین کاریش لای پەروەردگار

**ئەومیە کە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام دەبێت هەرچەندە کەمیش بێت "خذوا من الاعمال ما تطیقون فان الله لا یمل حتی تملوا وأحب العمل الی الله ما داوم علیه صاحبو وان قل" (بوخاري و مسلیم و ئەبواود و نسائي)**

**٤- رەحمەتی بەرانبەر بە سەرجەم بونەوەران:**

- **بەرانبەر بێباوەران:**

**- ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا، دوعا لەوانە بکە کەهاوبەشی بۆ خوا پەیدادەکەن کە لەناویان بەرێت، فەرمووی مـن بۆ نەفرەت لێکردن نەنێردراوم، بەڵکو بۆ رەحمەتکردن نێردراوم. " قیل یا** رسول الله ادع علي المشركين، قال: اني لم ابعثلعانا وانل بعثت رحمة" **(موسلیم).**

**- بینرا لە هەندێك شەرو جەنگدا ئافرەت کوژراوە، بۆیە پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ قەدەغەی کرد کە ئافرەت و منداڵ بکوژرێت.**

"وجدت امراة مقتولة في بعض مغازی رسول اللهفنهی رسول الله عن قتل النساء و الصبیان". (بوخاري)

**- کاتێك قەومەکەی ئازاری دەدەن و لەشار دەریدەکەن فریشتەی چیاکان پێی دەڵێت ئەگەر ئەتەوێ هەدوو چیای مەککە دێنمەوە یەك و سزایان دەدەم بەڵام پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەفەرمووت ئومێد دەخوازم لەخوای بەخشندە لە نەوەکانیان کەسانێك بێنێتە دونیاوە خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەن.**

• بۆ موسوڵمانان:

- پێغەمبەری ئیسلام لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت من لە هەموو ئیماندارەکانەوە زیاتر نزیکم لە نەفسیانەوە، هەر کەسێك مردو قەرزار بوو هیچی لەدوا بەجێ نەمابوو ئێمە قەرزەکەی دەدەینەوە، ئەوەشی ماڵ و سامان بەجێ دێڵێت دوای مردنی دەبێتە هی میراتگرەکانی. "أنا أولى بالمؤمنين من أنفسهم، فمن مات وعلية دين ولم يترك وفاء فعلينا قضاؤه، ومن ترك مالا فهو لورثته" (الترمذي)

ئەوەی ڕەحم بە خەڵکی نەکات خوای باڵا دەست ڕەحمی پێناکات. " من لا يرحم الناس لا يرحمه الله عزوجل" ( بوخاري و مسليم و احمد)

• بۆ منداڵان و پیرەکان:

لەئەنەسی کوری مالیکەوە پیاوێکی بەتەمەن ویستی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ ببینێت بەڵام دەوروبەرەکەی بەئاسانی ڕێگەیان نەدا (ڕێگەیان بۆ نەکردەوە) پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ فەرموی: لە ئێمە نیە هەر کەسێك بەزەیی بە بچوکەکاندا نەیەتەوەو ڕێزلە گەورەکان نەگرێت. "جاء شيخ يريد النبي فأيطا القوم عنه أن يوسعوا لة فقال النبي: ليس منا من لم يرحم صغيرنا، ويوقر كبيرنا " (الترمذي و صححه الالبانى).



● <u>بۆ مێینە:</u>

**هیچ یەکێك نیە سێ کچی هەبێت یان سێ خوشکی هەبێت، یان دوو خوشکی هەبێت یان دوو کچی هەبێت بەچاکی و بەفرمانی خوا رەفتاریان لەگەڵ بکات ئیلا دەچێتە بەهەشتەوە.** لايكون لأحد ثلاث بنات أو ثلاث أخوات أو بنتان أو أختان فيتقي الله فيهن ويحسن اليهن الا دخل الجنة" ( ابوداود و الترمذي).

● <u>بۆ هەتیوان (نازداران):</u>

**سەرپەرشتاری هەتیو من و ئەو وەکو ئەو دوو پەنجەیەین لە بەهەشت (پەنجەی شایەتمان و ناوەند)** " كافل اليتيم له او اغيره أنا وهو كهاتين في الجنة" ( البخاري و مسلم).

**پیاوێك سکاڵای دڵرەقی خۆی دەکرد لای پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ پێی ووت دەست بەسەر هەتیودا بێنە خواردنی هەژار بدە.** " عن ابي هريرة أن رجلا شكا الى رسول الله قسوة قلبه فقال له: امسح رأس اليتيم و أطعم المسكين " ( أحمد و صححه الالباني).

● <u>بۆ بێوەژن و هەژار:</u>

**ئەوەی هەوڵی خزمەتی بێوەژن و هەژار دەدات وەکو تێکۆشەر وایە لەپێناو سەرخستنی رێبازی خوا، وەکو کەسێك وایە شەونوێژ بکات و نەخەوێت، بەرۆژوبێت و بەربانگ نەکاتەوە.** "الساعي على الارملة والمسكين كالمجاهد في سبيل الله، وكالقائم لايفتر، والصائم لايفطر" (البخاري و مسلم).

• بۆ ئاژەڵ و گیانداران:

**- خوای بەخشندە لە ئافرەتێکی داوێن پیس خۆش بوو کاتێک بینی سەگێك لای بیرێك خەریکە تینوێتی دەیکوژێت، پێلاوەکەی داکەندو بە لەچکەکەی شۆری کردەوە ئاوی دەرهێنا بۆ سەگەکە** "غفر لامرأة مومسة مرت بكلب على رأس ركي كاد يقتله العطش، فترعت خفها فأوثقته بخمارها فترعت له من الماء فغفر لها بذلك " (بوخاري).

**هیچ موسمانێك نیە کەدارو درەختێك یان کشتوکاڵێك بروێنێت، کە باڵندە یان مرۆڤ یان ئاژەڵ لێی بخوات ئیللا بەهۆیەوە چاکەی بۆ دەنوسرێت.** " ما من مسلم يغرسا أو زرعا فياكل منه طير أو انسان أو بهيمة الا كان له به صدقة " (بوخاري و موسليم).

**- لەکاتی سەربرینی ئاژەڵدا فرمانمان پێدەکات کە چەقۆکان تیژبن و سەربرینەکەی ئاسان بێت و بەئازار نەبێت.** "ليحدأحدكم شفرته وليرح ذبيحته" ( مسلم و النسائي و الترمذي و ابوداود).

**- هەروەها دەڵێت هەرکەسێك باڵندەیەك بکوژێت بەبێ حەقی خۆی کە خواردنیەتی خوای باڵا دەست لە قیامەت پرسیاری لێدەکات لەسەر ئەو کارە.**

**- پێغەمبەری خوا گوێدرێژێکی بینی ناوچەوانی داخکرابوو بە ئاسن نەفرەتی کرد لەوەی ئەو کارەی کردووە.**

" ان النبي مر على حمار قد وسم في وجهه فقال: لعن الله الذي وسمه" (موسليم احمد و ابوداود).



● **پێغەمبەری ئیسلام هەمیشە وەك كەسێكی ئاسایی دلتەنگ بووە و گریاوە:**

**ئەو كاتانەی كە تیاییدا گریاوە:**

١- **كاتی مردنی ئیبراهیمی كوری كە فەرمووی (چاوەكان فرمێسك دەرێژن و دڵ تەنگ دەبێت بەڵان تەنها شتێك دەڵێن كە خوا لێی رازی بێت ئێمە بەكۆچكردنت ئەی ئیبراهیم دلتەنگین)** "تدمع العين ويحزن القلب ولا نقول إلا ما يرضى ربنا وإنا بفراقك يا إبراهيم لمحزونون " (البخاري ومسلم و ابوداود)

٢- **كاتێك گوێبیستی قورئان دەبوو بەتایبەتی كاتێك ابن مسعود دەخوێندەوە و گەیشتە ئایەتی** "فكيف إذا جئنا من كل أمة بشهيد وجئنا بك على هؤلاء شهيدا" (النساء ٤١) **بینی چاوەكانی بە لێشاو فرمێسك دەرژن.** (بوخاري و مسليم).

٣- **لەكاتی وەفاتی یەكێك لە كچەكانی (ام كلثوم) كە چاوەكانی فرمێسكی لێدەهات** "شهدنا بنتا للنبي قال: ورسول الله جالس على قبر، فرايت عينيه تدمعان " (بوخاری وئەحمەد).

٤- **لەكاتی وەفاتی هاوەڵێندا: لەكاتی مردنی عوسمانی كوری مزعون** " أن النبي قبل عثمان بن مظعون وهو ميت وهو يبكى، أو قال عيناه تذرفان "( الترمذي و أبوداود و ابن ماجة و احمد).

٥- **لەكاتی شەهیدبوونی زەید و جعفر و كوری رواحە لە جەنگی موئتە** "أن النبي نعى زيدا و جعفرا للناس قبل أن ياتيهم خبرهم،

فقال: أخذ الراية زيد فأصيب، ثم أخذ جعفر فأصيب، ثـم أخـذ ابـن رواحة فأصيب، عيناه تذرفان، ختى أخذ الراية سيف من سيوف الله ختى فتح عليهم "( بوخاری و ئەحمد).

● نەرم و نیانی پێغەمبەر:

**- پیاوێکی دەشتەکی عەرەب هاتە لای پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ و پێی ووت: ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن و ئێمە ماچیان ناکەین، پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ پێی ووت من چیت بۆ بکەم کەخوا سۆز و بەزەیی لە دڵت هەڵگرتبێت.**

"جاء اعرابي الى النبي فقال: تقبلون صبيانكم فما نقبلهم، فقال النبي أو أملك لك أن نزع الله من قلبك الرحمة" (فتح الباري ابن حجر).

**لە ئوسامەی کوری زید دەیفەموو پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ منی لەسەر رانێکی دادەنا و حەسەنی کوری عەلیش لەسەر رانەکەی تری و دەیفەرموو خوایە من ئەمانەم خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێن.**
"عن اسامة بن زيد كان رسول الله يأخذني فيقعدني على فخذه ويقعد الحسن بن علي على فخذه الاخر ثم يضمهما ثم يقول: اللهم اني أحبهما فأحبهما". (البخاري و احمد).

**- لەکاتی نوێژکردندا ئومامەی کچی زەینەبی دەکردە باوەش و کاتێك دەچووە سوجدەوە دایدەناو پاشان لە هەڵسانەوەدا دەیکردەوە باوەشی** " أن رسول الله كان يصلي وهو حامل أمامة بنت زينب، بنت

رسـول الله بنـت أبـي وقـاص، فـاذا سـجد وصـعها واذا قـام حملـها". ( بوخارى و موسليم و ئەبوداو و ئەحمەد).

**پێغەمبـەر ﴿د.خ﴾ دەفـەرموێت مـن دەچـمە نوێـژ، دەمـەوێت درێـژەی بـدەمێ بـەلاَم کـە گـوێم لـەگریانی منـداڵێك دەبێـت کـورتی دەکەمـەوە نـەك دایکەکـەی توشـی نارەحـەتی بکـەم** " انـي لأقـوم في الصـلاة أريـد أن أطـول فيهـا فـاسمع بكـاء الصـبي، فـأتجوز في صـلاتي كراهية أن أشق على أمه" ( البخاري و أحمد و النسائي و أبوداود).

**لـە عائشـەی دایکـی ئیمانداانـەوە هـیچ کـات پێغەمبـەر ﴿د.خ﴾ بەدەستی لە خزمەتکار یان ژنی نەداوە لەهیچ شتێکی نەداوە مەگەر لە کاتی جیهاد لەرێی خـوادا، هـەر کـات سـەربژێر بکرایـە لـە نێـوان دوو شـت ئاسـانەکەی هەڵدەبـژارد، هـەرکات گونـاه بوایـە دوورتـرین کەس بوو لە گوناه، هیچ کات تۆڵەی نەدەکردەوە لەبەر نەفسی خۆی مەگـەر سـنورەکانی خـوا ببەزاندرایـە لـەو کاتـەدا تۆڵـەی بـۆ خـوا دەکردەوە.** " ما ضرب رسول الله صلى الله عليه وسلم بيـده خادمـا لـه قط ولا امرأة ولا ضرب بيـده شـيئا إلا أن يجاهـد في سـبيل الله ولا خـير بين شيئين قط إلا كان أحبهما إليه أيسرهما حتى يكون إثمـا فـإذا كـان إثما كان أبعد الناس مـن الإثـم ولا انـتقم لنفسـه مـن شـيء يـؤتى إليـه حتى تنتهك حرمات الله فيكون هو ينتقم لله ". (أحمد)

**- نمونـەی نـەرم و نیـانی لـە یـاریکردنی لەگـەڵ منـداڵ و سـڵاو لێکردنیان و پێدانی خواردن پێیـان و دەسـت هێنـان بەسـەر هـەژار و بێباوکانـدا هاوشـێوەی نـەبووە و سـەرجەم بەڵگـە ئاینیـەکان ئـەو راستیانە دەخەنە روو.**

• **خورەوشتی بەرز و جوان:**

**پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەفەرموێت کاملترینی ئیمانی بروادار باشترینیانە لە خورەوشتدا** " أكمل المؤمنين ايمانا أحسنهم خلقا " (الترمذي و أحمد و أبوداود).

- **لەفەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت: چوار شت هەیە ئەگەر هەتبوو خەفەت بۆ دونیا مەخۆ لەوەی لە دەستت چووە: پاراستنی راسپاردە، راستگۆیی لە قسە، جوانی خورەوشت، داوێن پاکی)** " أربع اذد كن فيك فما عليك ما فاتك من الدنيا: حفظ أمانة، وصدق حديث، وحسن خليقة، وعفة في طعمة ". (أحمد)

**باوەردار بە جوانی خورەوشتی دەگاتە پلەی رۆژەوانی و هەڵساوە بۆ نوێژ** "ان المؤمن ليدرك بحسن خلقه درجة الصائم القائم " أبوداو و أحمد).

- **خوای بەخشنە لە سورەتی (القلم) ئایەتی (٤) وەسفی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەکات بە خاوەن خورەوشتی بەرز و بالا** ﴿وانك لعلى خلق عظيم﴾. **پێغەمبەریش باس لەوە دەکات کە نێردراوە بۆ تەواوکردنی خورەوشتە پەسەندەکان** "انما بعثت لأتمم مكارم االأخلاق" **(احمد) و لە عائشەیان پرسی سەبارەت بە خورەوشتی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ فەرمووی خورەوشتی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ وەك قورئان وابوو** "فان خلق نبيكم كان القران" (مسلم، أبوداود).

- **بەهۆی رەفتار و گوفتارە جوانەکانیەوە لە رۆژگارێکدا تەنها خۆی ئەم پەیامەی پێگەیشت بەڵام ئەمرۆ زیاترلە یەك ملیار**

موســـولمان هەیـــە. بەرادەیـــەك بـــاوەرداران شـــەیدای خورەوشـــتە جوانەكانی دەبوون یەكێكیان دەڵێت ﴿خوایـە گیـان رەحـم بـە مـن و محمد بكـە و بـە كەسـی تـر مەكـە (بوخـاری و موسـلیم) یـەكێكی تـر دەڵێت (باوك و دایكم بـە قوربـانی بێـت هـیچ مامۆسـتایەكم نـەدیوە، نەپێش ئەم نەدوای ئەم كەئەوەنـدە بـە چاكی فێـری زانسـتت بكـات، سوێند بەخوا نەخۆی لێتورەكردم و نەلێیدام و نەجنێویشی پێدام)( موسلیم).

- لە قورئاندا لە زیاتر لە ئایەتێك باس لە جوانی رەفتـار و سـۆز و بەزەیی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەكات.

- ﴿واخفض جناحك لمن اتبعك من المؤمنين﴾ (٢١٥ الشعراء)

بـاڵی خۆشەویسـتی و میهـر و سـۆز و بـەزەیی خـۆت نـەوی بكـە بـۆ ئیمانداران

﴿لقد جاءكم رسول من أنفسكم عزيز عليه ما عنتم حريص عليكم بالمؤمنين رءوف رحيم﴾ (١٢٨) التوبه. پێغەمبەرێكتان بۆ هاتووە لە خۆتان، زۆر بەتەنگ ئێوەوەیە بە تایبەتی ئیمانداران، زۆر بەسۆز و بەزەیی و میهرەبان و دلۆڤانە.

- ﴿وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين﴾ (الانبياء ١٠٧﴾

ئیمە تۆمان رەوانە كـردووە بـۆ ئـەوەی ببیتـە مایـەی سـۆز و میهر و بەزەیی بۆ سەرجەم بونەوەران.

- ﴿لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة لمن كان يرجو الله واليوم الآخر وذكر الله كثيرا﴾. (٢١ الاحزاب).

**لەپێغەمبەری خواوە پێشەنگێکی باشتان هەیە بۆ ئەوانەی ئومێدیان بەخوا و رۆژی دوایی هەیە و زیکری خوا زۆر ئەکەن.**

● بەخشندەیی و چاکە:

**لە جابری کوری عبدالله وە هیچ کات نەبوە داوای شتێك لە پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ بکرێت و بڵێت نا "ما سئل رسول الله صلی الله علیه وسلم شیئا قط فقال لا " (بوخاري و موسلیم)**

- **نمونەی بەخشندەی بۆ خەڵکی هەژار و نەدار لەکاتی دابەشکردنی داهاتی جەنگدا زۆر ئاشکرایە و دەیەها نمونەی راست و دروست هەیە.**

● دادپەروەری: **دادپەروەری یەکێك بووە لەسیفەتە گرنگەکانی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ و هەمیشە هانی هاوەڵانی داوە دادپەروەربن و لە رەفتارەکانیدا رەنگی داوەتەوە. لە قورئاندا لە زیاتر لە ئایەتێك باس لە دادپەروەری دەکات و دیارە خورەوشتی پێغەمبەریش قورئانە.**

﴿ولا تقربوا مال اليتيم إلا بالتي هي أحسن حتى يبلغ أشده وأوفوا الكيل والميزان بالقسط لا نكلف نفسا إلا وسعها وإذا قلتم فاعدلوا ولو كان ذا قربى وبعهد الله أوفوا ذلكم وصاكم به لعلكم تذكرون﴾ (الانعام ١٥٢)

**نەکەن نزیکی ماڵ و سامانی منداڵی هەتیو بکەون مەگەر بەکارهێنانی لە شتێکدا بەسوودوقازانجی تەواوبێت هەتا ئەو کاتەی گەورەدەبێت و ژیری تیابەدەردەکەوێت، کێشان و پێوان بە دادگەری ئەنجام بدەن، داخوازی و فرمان بەکەس نەکەین لە توانای بەدەربێت، کاتێك قسەدەکەن یان شایەتی دەدەن دادگەربن و لایەنی خزمەکانتان**

مەگرن، بەوەفاو بەئەمەك بن بەرامبەر پەیمانەکانتان، ئەمانە ئامۆژگاری پەروەردگارە بۆ ئێوە ئەو زاتەی فەرمانی پێداون بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن.

﴿إنَّ الله يأمُرُكُم أن تؤدُّوا الأمانات إلى أهلها وإذا حكمتُم بين النّاس أن تَحكُمُوا بالعدل إنَّ الله نعمّا يعظُكُم به إنَّ الله كان سميعا بصيرا﴾ (٥٨ النساء).

خوا فرمانتان پێدەکات بەدانەوەی گشت سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان وەکاتێك دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵکدا بەداد حوکم بکەن، بەراستی خوا بەچاکی ئامۆژگاریتان دەکات خوا هەمیشە بیسەری بینایە.

کاتێك باس لەو حەوت گروپە دەکات کە رۆژی قیامەت دەکەونە ژێر سێبەری خوای بەخشندە یەکێك لەو حەوت گروپە پێشەوایەکی دادپەروەردە " سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظل الا ظله: امام عادل..." ( بوخاری و مسلیم و احمد)

- کاتێك ئافرەتێك دزی دەکات و یەکێك لە هاوەڵێن دەچێت لای پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ شەفاعەتی بۆ بکات پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ پێی دەڵێت هاتویت بۆ بەزاندنی سنوری خوا شەفاعەت دەکەی، ئەوانەی پێش ئێوە ئەمە لەناوی بردن کاتێك خانەدان دزی بکردایە وازیان لێدەهێنا و کاتێك هەژار دزی بکردنە سزایان دەدا، بەخوا ئەگەر بێت و فاتمەی کچی محمد دزی بکات دەستی دەبرم). "أيُها النّاس إنّما أهلك الّذين قبلكُم أنّهُم كانوا إذا سرق فيهم الشّريفُ تركوهُ، وإذا سرق فيهم الضّعيفُ أقامُوا عليه الحدّ، وأيمُ الله، لو أنّ فاطمة بنت مُحمّد سرقت لقطعتُ يدها" (بوخاری مسلیم).

کاتێك هاوەڵێك دیارییەك دەبەخشێت بەیەکێك لە منداڵەکانی و داوادەکات پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ شاهید بێت لەسەر ئەو بابەتە پێی دەڵێت ئایا هەموو منداڵەکانی ترت هەمان دیارییت داونەتێ، دەڵێت نەخێر پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ پێی دەفەرمووت دەبیگێڕەوە، دادگەربن لە نێوان منداڵەکانتان( بوخاری و مسلیم) "اني نحلت ابني هذا غلاما، فقال أكل ولدك نحلته مثله؟ قال: لا، قال: فارجعه"

هەر کەسێك دوو ژنی هەبێت بەلای یەکێکیاندا دایتاشێ ( لایەنگری یەکێکیان بکات) ئەوە رۆژی قیامەت شانێکی خوارە."من كانت له امرأتان، فمال الى احداهما جاء يوم القيامة وشقه مائل ". (الترمذي و النسائي و ابن ماجة و أبوداود و أحمد).

- هاوسەنگی و دادگەری لەنێوان خێزانەکانی لە مانەوەی شەو و سەرفکردنی پارە بردنیان بۆ کاتی غەزاکردن، نمونەی زیندووی دادگەری و هاوسەنگی کەسێتی پێغەمبەرە ﴿د.خ﴾.

● بێفیزی و توازوعی پێغەمبەر:

هەر کەسێك لەپێناو خوادا بێ فیزی بنوێت خوا سەریدەخات " من تواضع لله رفعه " ( موسلیم و ئەحمد).

کاتێك پیاوێك دێت بۆ لای پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ و لەترسان جەستەی دەلەرزێت لەکاتی ئاخاوتن بۆ هێورکردنەوەی کەسەکە دەربڕینی بێ فیزی پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ پێی دەڵێت لەسەرخۆبە من پادشانیم من کوری ژنێکم نانە رەقەی دەخوارد (ئیبنوماجە) "أتي

**النبي رجل فكلمه فجعل ترعد فرائصه فقال له: هون عليك نفسك فاني لست بملك، انما أنا ابن امرأة كانت تأكل القديد".**

**پیاوێـك هاتـه لای پێغەمبـەر ﴿د.خ﴾ و پێـی ووت: ئـەی چاكترینی خەڵكی، پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ پێی فەرموو ئەوە ئیبراهیمە سەلامی خوای لێبێت (مسلم و ابوداود و احمد) " قال له رجل: یاخیر البریة، فقال النبي ذاك ابراهیم علیه السلام ".**

- هێمنی و لێخوشبوونی:

**كاتێك طفیل هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ فەرمووی هۆزی دوس سەركەچیان كرد و پشتیان وەرگێرا، دوعا بكە كە خوا لەناویان بەرێت پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ رووی كردە قیبلە و دەستی بەرزكردەوە خەڵكەكە ووتیان لەناوچوون، فەرمووی: خودایە هیدایەتی دوس بدەیت و بەرەو ئیسلامبوون بێن.) "جاءالطفیل بن** عمر الدوسیالی رسول الهە فقال: ان دوسا قد عصت و أبت، فأدع الله غلیهم، فأستقبل رسول الله القبلة ورفع یدیه، فقال الناس: هلكوا. فقال: اللهم اهد دوسا وائت بهم، اللهم اهد دوسا وائت بهم". ( البخاري و مسلم).

**- كاتێك زەیدی كوری سعیە داوای قەرزەكەی لێكرد بە شێوەیەكی نەشیاو پەلاماری دا و قسەی نەشیاوی پێ وت ئیمامی عومەر ویستی ئازاری بدات پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ پێی ووت واباشە بەمن بڵێی قەرزەكەی بدەرەوە و بەویش بڵێی بەشێوەیەكی جوان**

**داوای قەرزەکەی بکات، بڕۆ قەرزەکەی بدەرەوە و بیست مشتیش خورمای زیادەی بدەرێ ( ابن حجر و الحاكم)**.

**- کاتێك عەرەبێکی دەشتەکی پەلاماری دەدات و ملی کراسەکەی هێندە توند دەگوشێت کە شوێنەواری بەلای ملی پێغەمبەرەوە دەردەکەوێت پێ دەڵێت: لەو ماڵەی خوا پێی بەخشیویت بەشم بدە، پێغەمبەریش لێی تورە نابێت فرمان دەکات بەشی بدەن.**

"عن انس بن مالك كنت أمشي مع رسول الله وعليه برد نجراني غليظ الحاشية، فأدركه أعرابي فجبذه بردائه جبذة شديدة حتى نظرت الى صفحة، عاتق النبي قد أثرت به حاشية الرداء من شدة جبتة، ثم قال: يا محمد، مر لي من مال الله الذي عندك، فالتفت اليه رسول الله فضحط، ثم أمر له بعطاء" (البخاري و مسلم)

**کاتێك ئازاریان دا و بریندارایان کرد خوێنەکەی دەسری دەیفەرموو: خوایە لە قەومەکەم خوشبە ئەوان نازانن.** "اللهم أغفر لقومي فانهم لا يعلمون". ( بوخاري و مسليم).

- ئاسانکاری و نەرم نیانی:

**لە زیاتر لە فەرمودەیەکدا باس لە کار ئاسانی دەکات و داوا دەکات کار ئاسان بن نەك گرانکار، مژدە بەخش بن نەك ترسێنەر، گونجاو بن و جیاواز مەبن** "يسرا ولا تعسرا، و بشرا ولا تنفرا، و تطاوعا ولا تختلفا" (بوخاری و مسليم).

- ئەگەر خوای بەخشندە خێروخۆشی بۆ خانەوادەیەك بوێت، سۆز و میهرەبانی دەخاتە نێوانیانەوە. "اذا أراد الله باهل بيت خيرا أدخل عليهم الرفق" ( أحمد).

- كاتێك گەنجێك داوای لێدەكات رێگای بدات بۆ زیناكردن هەوڵەكانی داوای بێدەنگبوونی لێدەكەن، بەڵام پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ بە شێوازێكی جوان هەڵەی داواكەی تێدەگەیەنێت كە پێی دەڵێت رازی دەبیت زینا لەگەڵ دایكت، خوشكت، پورت، ئامۆژنت بكرێت بۆیە پێی دەڵێت ئەو خەڵكەش حەز ناكات لەگەڵ كەسوكاری بكرێت، بۆیە دوعای خێری بۆ دەكات. (أحمد).

لە فەرمودەیەكی تردا دەفەرموێت ( خوا میهرەبانە و میهرەبانی خۆش دەوێت، ئەوەی بە میهرەبانی دەیبەخشێت بە توندوتیژی نایبەخشێت، لەسەر هیچ شێوازێكی تر نایبەخشێت) "ان الله رفيق يحب الرفق، و يعطي على الرفق مالا يعطى على العنف، وما لا يعطي على ما سواه". ( مسلم).

نەرم و نیانی لەهەر شتێك بێت قورس و بەهاداری دەكات، لەهەر شتێك نەبێت ئەوە بێ بەهای دەكات. " ان الرفق لا يكون في شيء الا زانه، ولا ينزع من شيء الا شانه". ( مسلم و أبوداود و أحمد).

- نەرم و نیانی بە خێرو چاكە و رەوشت جوانی وەسف دەكات "من أعطي حظه من الرفق أعطي حظه من الخير، وليس شيء أثقل في الميزان من الخلق الحسن". ( مسلم و أحمد).

- کاتێك عەرەبییەکی دەشتەکی لە مزگەوتدا میزدەکات، پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ وازیلێدێت تا تەواو دەبێت پاشان پێی دەڵێت مزگەوت بۆ زکرو خوا پەرستیە نەك میزکردن، داوا لە هاوەڵێك دەکات ئاو بکات بە شوێنی میزەکەیدا.( بوخاری و موسلیم).

- دانایی و حکمەتی:

- بانگەشەی هێمنانە و لەسەرخۆ سەرەرای ئەو توندوتیژیەی بەرانبەری دەکرا لە مەککە و پاشان لە مەدینە لەلایەن جولەکەکانەوە.

- دروستکردنی مزگەوت بۆ بلاوکردنەوەی برایەتی و خۆشەویستی.

- دروستکردنی برایەتی لە نێوان کۆچبەران و پاڵپشتەکان.

- بلاوکردنەوەی ئاشتی و تەبایی لەنێوان خەڵکی و رێزگرتنی یەکتر و هاوسێ و پیرو منداڵ.

زۆر فەرمودە هەیە لەو بارەیەوە کە باس لەوە دەکات، باوەری هیچ کامتان کامل نیە تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت، " لا یومن أحدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه " ( بوخاری و مسلیم). بروادار بۆ بروادار وەك باڵەخانە وایە یەکتری پتەو دەکەن، پەنجەکانی دەستی خستە ناو یەکەوە، "المؤمن للمؤمن کالبنیان یشد بعضه بعضا، وشبك بین

أصــابعه". ( البخــاري). هــەروەها دەفــەرموێت: حەرامــە لەســەر موسولمان خوێن و ماڵ و شەرەفی موسولمانان " كل مسلم على مسلم حرام: دمه، وماله، و عرضه ". ( مسلم). رەوانیـە موسـولمان سـێ شەو زیاتر لە برای موسولمانی دابرێت و ئەوەی سەلام دەكات چاكترە لەوی تر "لا يحل لمسم أن يهجر أخاه فوق ثلاث ليال، يلتقيان فيعرض هذا، ويعرض هذا، وخيرهما الذي يبدأ بالسلام ". ( البخاري و مسلم). هـەروەها دەڵێـت ناچـنە بەهەشـتەوە تـاكو ئیمانـدار نـەبن، ئیمانـتان تەواونیــە تــا یــەكترتان خــۆش نــەوێت، ئایــا شــتێكتان پێبڵــێم كــە خۆشەویستیان زۆربێت سلاو لەیەكتری بكەن و وەڵامی سلاو بدەنەوە " لاتدخلون الجنة حتـى تؤمنـوا، ولا تؤمنـوا حتـى تحـابوا، أولا أدلكم علـى شـيء اذا فعلتمـوه تحـاببتم، أفشـوا السـلام بيـنكم" ( مسـلم و أبـوداود) هــەروەها دەڵێــت جنێــودان بــە موســولمان خراپەكاریــە و شەركردنیش لەگەڵی بێ باوەری و كوفرە "سباب المسم فسوق، وقتاله كفر". ( بوخاري و مسليم).

• راستگۆیی:

• یەكێك لە هەرە سیفەتە جوانـەكانی مـرۆڤ خۆشەویسـت هـەر پێش بە پێغەمبەربوونی لەناو خەلكـدا ناسـراوبوو بـە راسـتگۆ وجـێ متمانـە ( الصـادق الامـين). دەمیـەها بەڵگـەی مێـژووی هەیـە لەسـەر راستگۆیی پێغەمبەر.

• عومـەری كـوری عـاص دەڵێـت وام زانـی مـن لای پێغەمبـەر ﴿د.خ﴾ لەهەموو كەسێك خۆشەویسـترم بۆیـە لـە پێغەمبـەرم پرسـی من باشترم یان ئەبوبەكر ووتی ئەبوبـەكر پاشـان ووتم مـن یـان عمـر ووتی عمر ووتم من یان عوسمان ووتی عوسمان راسـتیەكەی پـێ ووتم هەتا خۆزگەم ئەخواست نەم پرسیبایە.

"عمرو بن العاص رضي الله عنـه قـال ﴿كـان رسـول الله صلى الله عليـه وسلم يقبـل بوجهـه وحديثـه على أشـر القـوم يتـألفهم بـذلك فكـان يقبـل بوجهه وحديثه عليَ حتى ظننت أني خير القوم فقلت يا رسول الله أنا خـير أم أبو بكر فقال أبو بكر فقلت يا رسول الله أن خير أم عمر فقال عمر فقلـت أنا خير أم عثمان فقـال عثمـان فلمـا سـألت رسـول الله صلى الله عليـه وسـلم فصدقني فلوددت أني لم أكن سألته " (رواه الترمذی).

• "أرأيـتكُمْ لـو أخبَـرتكُمْ أنَ خيلًـا بـالوادِي تريـدُ أنْ تغـيرَ علـيكُم، أكُنـتُمْ مُصَدِقيَ؟، قالوا: نعمْ، ما جرَبْنا عليْكَ إلا صِدقًا: (بوخاري)

پێغەمبـەر دەفـەرمووێت: ئەگـەر پێتـان بڵـێم لـەو دۆڵـەوە هێـرش دەكرێتـە سـەرتان، بـاوەرم پێدەكـەن؟ وتیـان: بـەڵێ، تـەنها راسـتیمان لـێ بیستویت.

• ﴿علـيكُم بالصِـدقِ، فـإنَ الصِـدقَ يهْـدِي إلى البِـرِ، وإنَ البِـرَ يهْـدي إلى الجنَةِ﴾. (موسليم)

راسـتگۆبن، چـونكە راسـتگۆیی سـەردەنێت بـەرەو چـاكە، چـاكەش رێنمویت دەكات بۆ بەهەشت.

• تەنانەت لەكاتی سوعبەتكردندا هـەر راسـتگۆیی پێوەدیـاربوو ئـەبی هـورەیرە دەڵێـت ( فـەرمومان ئـەی پێغەمبـەری خـوا تـۆ سوعبەتمان لەگەڵ دەكەی فەرمووی من جگە لە راستی هـیچ نـاڵێم). (رواه الترمزی)

## پێغەمبەر لە ووتەی نوسەر و روناکبیرەکانەوە

کاتێـك مـرۆڤ لـە ژیانیـدا سـەرکەوتوو دەبێـت و هـاوژین و منـداڵ و هـاورێ و هاوپیشـە و شـوێنکەوتوانی ڕێـزی تایبـەتی دەگـرن و هـەر یەکـەیان بـەجۆرێك خۆشـی دەوێـت و وەسـفی دەکات، ئەمـە شـتێکی گـرنگ و پـیرۆزە لـە ژیانـدا بـەڵام کاتێـك کەسـانێك دێـن هـیچ پەیوەندیـەکی راسـتەوخۆیان لەگـەڵ ئـەو کەسەدا نیە بەڵام بەویژدانەوە هەڵسەنگاندن بۆ مێژووی ژیان و خزمـەتی ئـەو کەسـە دەکـەن، دەگەنـە ئـەو بـاوەڕەی کـەناتوانن وەسفی خزمەت و مرۆڤدۆسـتی ئـەو کەسایەتیە نەکـەن ئەمانـە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە کە کەسانی بێلایەن و هەنـدێك کـات نەیارەکانیشت وەسفت بکەن.

لێـرە تـەنها بـاس لـەو کەسـایەتی و نوسـەر و روناکبیرانـە دەکەین کە لە بنەڕەتدا موسوڵمان نین و بۆچوونی خۆیان لەسەر پێغەمبەر خستۆتە روو:

<u>برنادشۆ</u>: هەمیشە دینی محمدم لە پلەیەکی تایبـەتی ئاشـتی داناوە بەهۆی زیندوبونەوەی، وای بۆ ئەچم تاکە دینێك بێت کە توانای ژیانی هەیە بۆ قۆناغـە جیاوازەکـانی ژیـان بـەجۆرێك کـە سەرنجراکێش بێت بۆ هەموو کات و شوێنێك.

لـەو بـاوەڕەدام ئەگـەر پیـاوێکی وەك محمـد جڵـەوی فـەرمانڕەوایی لەهـەموو جیهانـدا بگرێتـە دەسـت سـەرکەوتوو

دەبێـت لـە چارەسـەری کێشـەکانی و بـەڕێوەبردنی بـۆ خێـر بەجۆرێك ئاشتی و ئارامی بهێنێتە دی.

تولستۆی: گومانی تێدا نیە ئەم پێغەمبـەرە لـە گـەورەترینی مامۆستاکانە کە خزمـەتی گـەورەی کۆمەڵایـەتی کـردووە، بەسـە بـۆی وەك شـانازی کـە هـەموو میللەتەکـەی بـەرەو ڕۆشـنایی دادگەری برد و والیلێکرد ئاشتی خوازبێت و وازبێنێت لە خـوێن ڕشتن. پیاوێکی وەك ئەو جێی ڕێز و پێزانیە.

غانـدی: ویسـتم بـزانم سـیفەتەکانی ئـەو پیـاوە چـیە کـەبێ ڕکابـەر دڵـی ملیۆنـان کەسـی ڕاکێشـاوە بۆخـۆی، بەتـەواوی لـەو باوەڕەدام کە شمشێر هۆکار نەبووە بۆ ئەوەی ئیسلام بگاتـە ئـەم پێگەیەی ئێستای، بـەڵکو ئـەوە لـەڕێی خـاکیبوونی پێغەمبـەر و ووردبینی و ڕاستگۆیی لە پەیمانەکانیدا بـووە، لێـبران و دڵسۆزی بۆ هاوەڵان و شوێنکەوتوانی، ئازایەتی و متمانـەی ڕەهـای بـەخوا و پەیامەکـەی، ئـەم ڕەفتارانـە ڕێگـە خۆشـکەربوون بـۆ زاڵبـوون بەسەر ئاستەنگەکان نەك شمێر.

لامـــارتین(بیرمەنـــدی فەرەنســـی): ئەگـــەر پێوەرەکـــانی بەهرەمەندی مرۆڤ بەوە بپێورێت بەرزی ئامانـج و ئەنجامەکـەی سەرەرای کەمی هۆکارەکانی بەردەست، ئـەوە کـێ بـوێری ئـەوەی هەیـە بـەراووردی کەسـە مەزنـەکانی مێـژووی نـوێ بکـات بـە پێغەمبـەر محمـد لـە بەهرەمەندیـدا. بەناوبانەگـەکان چـەکیان

دروستکرد، یاسایان دانا، ئیمپراتۆریەتیان دروستکرد، تەنها سەرفرازیەکی کاتیان بەدەستهێنا پاش خۆیان زۆرخێرا شتەکانیان نەما و لەناوچوو، بەڵام ئەم پیاوە محمد رابەری ملیۆنان کەسی کرد کە یەك لەسێ جیهان دەبوو لەو کاتەدا، نەك تەنها ئەمە بەڵکو کۆتایی بە بتپەرستی و بیر و باوەرە پوچەکان هێنا.

ئەوە محمدە فەیلەسوف و ووتاربێژ و پێغەمبەر و یاسادانەر و جەنگاوەر و لەناوبەری ئارەزووبازی و دامەزرێنەری مەزهەبی بیری خواپەرستی راستی بەبێ بت پەرستی و زاربازی، ئەو دامەزرێنەری بیست ئیمپراتۆریەتە لەسەر زەوی و یەك ئیمپراتۆریەتی رۆحانی ئەوە محمدە.

مونتگومێری: ئامادەباشی ئەم پیاوە بۆ بەرگەگرتنی ئەو چەوساندنەوەی توشی هات لەپێناو بیروباوەرەکەیدا، سروشتی ئاشتی خوازانەی ئەوانەی باوەریان پێهێناوە و شوێنکەوتەیین و کردویانە بە رابەر و سەرکردەی خۆیان، شان بەشانی ئەو دەستکەوتە مەزن و رەهایەی بەدیهاتووە، ئەمانە هەمووی بەڵگەی دادپەروەری و پاکی کەسێتی محمدە.

مایکل هارت: هەڵبژاردنم بۆ محمد بە گرنگترین و مەزنترین کەسی مێژوو، رەنگە خوێنەران سەرسام بکات، بەڵام تاکە پیاوێکە بەدرێژای مێژوو کە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە لەهەردوو ئاستی دونیا و قیامەت.

كـارل مـاركس: ئـەم پێغەمبـەرە بەپەیامەکـەی سـەدەیەکی نوێی لە زانست و روناکی و رۆشنگەری هێنا، ووتەو رەفتارەکانی بە زانستی نوسـراونەتەوە، بـەپێی ئـەوەی ووتـەکانی بـە سـروش دادەنرێت لەسەری بوو هەرچی گۆرانکـاری و ناتـەواوی هەیـە لـە ئایینـەکانی تـر بیسـرێتەوە، محمد مـەزنی مەزنـەکانی جیهانـە، ئەو ئاینەی کە هێناویەتی لەهەموو ئاینەکان کاملترە.

د. هـانز کـونگ: محمـد پێغەمبـەری راسـتەقینەیە بـەواتای ووشـە، نـاتوانین چـیتر نکـوڵی لـەوە بکـەین کـە محمـد رابـەر و سەرکردەیە بۆ رێگای سەرفرازی.

مێـژوونوس کریسـتوفەر دارسـون: لـە پـەرتوکی (یاسـاکانی بزوتنەوە (جوله) لەمێژووی جیهان)دا دەڵێت: بارودۆخی جیهان گۆرانکاری لـەناکاو و گـەورەی بەسـەرهات بـەهۆی رەفتـاری تاکـە کەسێك لەمێژوودا ئەویش محمدە.

رۆژهەلاتناسـی ئیسـپانی جـان لیـك لـە کتـێبی (عـەرەب) دا دەڵێت: ناتوانرێت ژیانی پێغەمبەر بەوە جوانتر وەسفبکرێت کـە خـوا وەسـفی کـردووە ﴿ومـا أرسـلناك الا رحمـة للعـالمين﴾ محمـد رەحمەتێکی راستەقینە بوو.

# بەشی پێنجەم

دەروون لە قورئاندا.

ئیسلام و دەروون دروستی

دینداری و دەروون دروستی

## دەرون لە قورئاندا

قورئانی پیرۆز باس لە هەندێك جۆر دەرون ( النفس) كراوە و هەر یەكەیان تایبەتمەندی خۆی هەیە:

١- دەرونی خراپەكار: ئەو دەرونەیە كە فرمان بەتاك دەكات خراپە بكات و شوێن هەوەس و ئارەزووەكانی بكەوێت و بۆئەوەی بگاتە ئامانجەكانی، لاری نیە لەوەی زیان بە دەوروبەر بگەیەنێت، لە سورەتی یوسف ئایەتی (٥٣) خوای گەورە بەو جۆرە وەسفی دەرونی زولێخا دەكات ﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيَ إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (یوسف ٥٣) من هەرگیز پاكانە بۆ خۆم ناكەم بەراستی نەفس زۆر فرماندەرە بە خراپە.

٢- دەرونی لۆمەكار: ئەو دەرونەیە كە لۆمەی خۆی دەكات لەسەر خراپە و هەمیشە لە شەردایە لەگەڵ نەفسی خۆی تاوێك دەرونی خراپەی پێدەكات تاوێكی تر بە لۆمەكردن و دوعا ناخی خۆی پاكدەكاتەوە پاش ماوەیەك هەمان هەڵە یان هەڵەی تر دەكاتەوە، خوای بەخشندە سوێندی پێدەخوات ﴿وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾ (القیامة ٧٥).

٣- دەرونی ملهمە: خاوەنی ئەم جۆرە دەرونیە دەزانێت باش و خراپ، دروست و نادروست چیە، بەڵام دەرونی تاوێك كاری باشەی پێدەكات تاوێك خراپە، پلەی دەرونی لە ئاستێكدا نیە بتوانێت هەمیشە باش یان خراپ بێت بۆیە زۆرگرنگە خاوەنی ئەم دەرونانە لەكەسانی خراپەكار بەدوور بن چونكە بەئاسانی ئەگەری

خراپەکردنیان هەی هەر وەك چۆن گرنگە هاوەڵی کەسانی دەروونی ئارام و سەقامگیر بکەن بەوەی دەروونیان حەز بەکارە باشەکان دەکات.

﴿ونفسٍ وما سوّاها * فألهمها فجورها وتقواها﴾ (الشمس ٧-٨)

٤- دەروونی لەرزۆك و ناجێگیر: ئەو دەروونەیە کەلەسەر بارێك ئۆقرە ناگرێت هەر تاوەی بەلایەکدا دەکەوێت هەرگیز ناتوانێت بەتەواوی یەکلابێتە نەبۆ خراپە نەبۆ باشە، هەر لایەك دەگرێت هەست بەئارامی ناکات و هەمیشە نارەحەتی بێزاری لە ناخیدایە، ئەو کارەی دەیکات بە یەقینەوە نیە بۆیە ناتوانێت بگاتە ئەو پلەی هەست بە ئارامی دەروون بکات، لە رۆژگاری ئەمرۆدا نمونەی ئەمانە زۆرە تاوێك وەك دیندار تاوێك دونیادار بەڵام لە هیچیان نەسەرکەوتوون نەئارامگرن. ﴿مُذبذبين بين ذلك لا إلى هؤلاء ولا إلى هؤلاء ومن يضلل الله فلن تجد له سبيلا﴾( النساء ٤)

٥- دەروونی ئارام و سەقامگیر: گەشتۆتە پلەیەك لە یەقین کە شتەکانی دونیا فریوی نادات و شەیتان ناتوانێت زەفەری پێببات و دوورە لە ترس و دڵتەگی، هەمیشە لە گوێرایەڵی فرمانەکانی خودادایە، ﴿يا أيتها النفس المطمئنة * ارجعي إلى ربك راضية مرضية﴾ (الفجر ٢٧-٢٨). ئەی دەروونی بە ئارام و سەقامگیر بگەرێرەوە بۆ لای پەروەردگارت بەرەزامەندی و لێ رازیبوو.

زۆر گرنگە خاوەن ئەم جۆرە دەروونە بتوانێت چێژ لە عیبادەت وەرگرێت و پلەی ئیمانی خۆی بەرزکاتەوە چونکە دەشێت هەندێکیان پاش ماوەیەك شەکەت بێت و نەتوانێت بەپێ پێویست

چێژ لە عیبادەت وەرگرێت بە تایبەتی ئەگەر لەسەرو توانای خۆیەوە خەریکی عیبادەت بێت بۆیە ئەگەر دابەزینی پلەی دەرونی هەیە، ئەمەش لە هەندێك کەسدا بەدیدەکرێت کە ماوەیەك زۆر بە گەرمی و توندی شوێنکەوتەی ئایین دەبن پاش ماوەیەك ساردبونەوەیان تیادا بەدەردەکەوێت چونکە پلەکانی باوەر و دەرون دەبێت پێکەوە گەشەبکەن تا بتوانن ئارامی و سەقامگیری بەناخ فەراهەم بکەن.

٦- دەرونی رازیبوو: ئەو دەرونەیە کە رەزامەندە بەوەی خوای بەخشندە پێی بەخشیوە. ﴿یا أیتها النفس المطمئنة * ارجعي إلى ربك راضیة مرضیة﴾ (الفجر ٢٧-٢٨).

٧- دەرونی رەزامەندبوو: ئەو دەرونەیە کەخوای بەخشندە لێی رازیبوەو بانگی دەکاتەوە بۆ لای خۆی. (یا أیتها النفس المطمئنة * ارجعي إلى ربك راضیة مرضیة﴾ (الفجر ٢٧-٢٨).

٨- دەرونی کاملبوو (پالفتە): ئەو دەرونیە کەبەتەواوی لە پەروەردگارەوە نزیکە و هەموو رەفتار و کردار و گوفتاری بە قورئانە و کاتێك مامەڵەی لەگەڵ دەکەیت هەست دەکەی پەرتوکێکی قورئانە و بەسەر زەویدا دەروات کە دەرونی پیاوچاکان و ساڵحانە ﴿ألا إن أولیاء الله لا خوف علیهم ولا هم یحزنون﴾ (٦٢ یونس)

وەك دەبینین پلەکانی دەرون لە قورئاندا بەپلەی دەرونی پڕ خراپەکاری دەست پێدەکات کەهەوڵدەدات هەر شتێك نەفس پێی خۆشە بیکات کەئەمەش لای فرۆید بە (ID) ناو دەبرێت، واتە ئەو

ئاستەی کە تاك تەنها هەوڵی تێکردنی حەزەکانی خۆی دەدات بەبێ گوێدانە یاسا و ڕێسا کۆمەلایەتی و ئایینیەکان و خۆی سەنتەری هەموو شتێکە و حەزەکانی خۆی لەسەرو هەموو پێوەرەکانەوەیە.

بەلام دەرونی دووەم دەرونی لۆمەکارە کەلای فرۆید (SUPER EGO) واتە منی باڵا کەتاك زۆر پەیوەست دەبێت بە ڕێکارە یاسایی و کۆمەڵایەتی و کەلتوریەکان و بەردەوام لۆمەی خۆی دەکات ئەگەر کارێك بکات پێچەوانەی ئەوانە بێت یان بۆ کردنی کارێك بەردەوام لۆمەی خۆی دەکات نەك ئەم کارە زیان بەکەسانی تر بگەیەنێت و ببێتە مایەی شەرمەزاری و گازندەی کۆمەڵایەتی.



## ئیسلام و دروستی دەروونی

مەبەست لە سەدەکانی ناوەراست سەدەی پێنج بۆ سەدەی پانزدەی زاینە، ئەو سالآنەی ناو دەبرێت بە سەدەکانی تاریکی، نەزانی و نەفامی و گەڕاندنەوە بۆ دواوە باڵی بەسەر ئەوروپادا کێشابوو و دونیای نوقمی تاریکی دەکرد و چرای زانست رووی لە ناوچەیەکی تری جیهان کرد، دونیای ئیسلام بووە پێشەنگی وولآتان لە زانست و داهێنان بە سوود وەرگرتن لە زانستی رۆمان و یۆنانەکان.

لەئەوروپا رێگری دەکرا لە خوێندنەکانی یۆنان و رۆما بەناوی ئەوەی ئەمە بتپەرستی و بێباوەریە و نەخۆشی دەروونی جارێکی تر گەڕێندرایەوە بۆ رۆحە شەنگێز و خراپەکان.

لە جیهانی ئیسلامدا بەهۆی بلآوبونەوەی ئاینی ئیسلام و رێگری لە کوشتنی نەفس و دانانی بە تاوانێکی گەورە فرمانکردنی بە مامەڵەی چاك لەگەڵ لاواز و نەخۆشدا، ئەوانەی نەخۆشی دەرونیان هەبوو لە کوشتن و سوکایەتی پێکردن تارادەیەکی زۆر رزگاریان بوو. هەروەها سەردەمی دروستکردنی نەخۆشخانەی تایبەت بە نەخۆشە دەرونیەکان دەستی پێکرد پێیان دەوت (بیمارستان) یەکەم بیمارستان لەلایەن وەلیدی کوری عبدالملك (شەشەم خەلیفەی ئەمەویەکان) لەساڵی (٨٨ کۆچی – ٧٠٧ زاین) دروستکراوە پاشان لە دیمەشق و میسر و هەندێك ناوچەی تر دروستکرا. زۆر لە دامەزراوە دەرونیەکانی ئەوروپا پێشکەوتووتر بوو بەجۆرێك هاوتای نەبوو لەجیهانی ئەو کاتەدا و بێگومان ئەم بیمارستانانە بەپێی کات ئاستی خزمەتگوزاریان دەگۆرا بەپێی ئەوەی دەستەلآتی ئەو کاتە تا چ رادەیەك باوەری بە کاری ئەم بیمارستانانە هەبوو.

١- ساڵی (٨٨) کۆچی خەلیفەی ئەمەوی (وەلیدی کوری عبدالملك) لە دیمەشق یەکەم نەخۆشخانەی بۆ نەخۆشییە دەروونیەکان دروست کرد.

٢-ساڵی (١٥١) کۆچی عەباسییەکان لە بەغداد یەکەم بەشی نەخۆشی دەروونییان دروست کرد، پاشان لەسەر ئەم شێوازە بەشی دەروونی لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا دروستکرا، بەناوبانگترینی نەخۆشخانەی (قلاوون) بۆ لە میسر.

٣-پاشان لە سەفاقسی تونس و هەندێك ناوچەی تر دروستکرا.

٤- ئەم خەستەخانانە باشترین خزمەتیان هەبووە لەرووی خواردن و پۆشاك و پاکوخاوێنی.

تایبەتمەندی ئەم نەخۆشخانانە لەوەدا بوو لەگەڵ بەشەکانی تری پزشکی (نەشتەرگەری، هەناوی، چاو) پێکەوە بوون بۆ ئەوەی نەخۆش هەست بە جیاکاری نەکات، بەشداری کۆمەڵگە لە پرۆسەی چاودێری و خزمەتی نەخۆش. هەروەها هەر نەخۆشەی دوو یاوەری هەبووە و ئەوانەی خەویان نەبووە کەسانێکیان بۆ بانکردوون کە چیرۆکیان بۆ بگێرنەوە تا خەویان لێبکەوێت، کاتی چاکبونەوەی وەك دیاری و پاڵپشتی پێنج ئالتونیان دەدانێ بۆ دەستکردن بە پیشەیەك.

٥-پاشان لەسەردەمی سەلجوقیەکان و عوسمانیەکان لەنزیك مزگەوتەکان ناوەندی کۆمەڵایەتی بۆ چارەسەرکردن دامەزرا پێیان دەوت (تەکیێ) کە دواتر وەك ناوەندی خوێندن سوودی لێدەبینرا.



دوو تێبینی:

١- پاش ساڵانێکی زۆر لەو داهێنانە پاشان لە ئەوروپا نەخۆشخانەی دەروونی دروستکرا بە سوود بینین لە مێژووی پرشنگداری ئیسلام.

٢-ئەوەی ئەمرۆ لە ئەمەریکا و لە هەندێك وولاتی ئەوروپا دروستکراوە کە خانوی بچوك هەندێك نەخۆشی تیا دادەنرێت و بۆ چارەسەر پێش سەدەها ساڵ هاوشێوەی ئەوە لە نزیك مزگەوتەکان دروست کراوە.

لەمێژووی ئیسلامدا نوسەر وبیرمەندی گەورە پەیدابوون لەبارەی دەرونیەوە و گرنگترینیان (غەزالی و رازی و ابن حزم و ابن تیمیە و ابن قیم کە بایەخیان بە چارەسەری هزری و رەفتاری داوە. هەوڵیان داوە رەفتاری نادروست و نەشیاوی تاك بە پێچەوانەکەی چارەسەر بکەن، هەروەها هەوڵیان داوە هزری تاك گۆرانکاری تیدابکەن لەو بۆچوونەی کە شێوازی بیرکردنەوە کاردەکاتە سەر جۆری رەفتاری تاك. (ئەمەش لە زانستی ئەمرۆدا بە کاریگەرترین شێوازی چارەسەری دەرونی دادەنرێت شێوازی چارەسەری رەفتاری و شێوازی چارەسەری زانەکی رەفتاری).

ئیبن سینا لەو کاتەدا باس لەوە دەکات کەبیرچونەوە بەهۆی تێپەربوونی کاتەوە نیە بەڵکو زیاتر پەیوەندی بە تێکەڵبوونی زانیاریەکانەوە هەیە و زانستی ئەمرۆش هەمان بۆچوونی هەیە.

هـەروەها ئـیبن سـینا و فـارابی باسـیان لەخـەوبینین کـردووە و ڕاڤەکردنی هەندێك لە ئاماژەکانی خـەوبینین و ڕۆڵـی خـەوبینین لـە تێرکردنی هەندێك لە ئارەزوو و پاڵنەرەکان.

هـەروەها غـەزالی لـە پـەرتوکی (زیندووکردنـەوەی زانسـتەکانی ئایین) لە بەشی تایبەتـدا بـاس لـە ڕەفتـار و پاڵنـەر و هەڵچونەکان و سۆز دەکات و ڕۆڵیان لە پەروەردەدا.

پاشـان لـە نەخۆشـخانەی قـیروان زانـای پایەبـەرز (ئسـحاق کـوری عمـــران) خـــاوەن دەستنوســـی (میلانخۆلیـــا) پەیـــدا دەبێـــت کەلەپەرتوکەکەیدا باس لە نیشانەو هۆکارەکانی میلانخۆلیـا دەکـات و لەبەشی دووەمی هەمان دەستنوسدا بـاس لـە شـێوازی چارەسـەرکردن دەکات بەم جۆرە:

١- چارەسەرکردن بە شێوازی دەرونـی و بایەخـدان بـە نـەخۆش و ووتەی جوان و هاندەر ودڵدانـەوەی نـەخۆش و گەرانـدنی بـە هـەوای کراوە و دەشت و باخچەکاندا.

٢-چارەسـەرکردن بـە خـواردن: بـە پێـدانی هەنـدێك خـواردن و ڕێگری کردن لەهەندێکی تر.

٣-چارەسـەرکردن بـە شـێلان بـە زەیتـی زەیتـون و حـەمامکردن (خۆشتن).

٤- چارەسەرکردن بە دەرمان و گیراوە.

ابومحمد کوری حزم الظاهري لە کتێبەکەیدا بـاس لـە دەرونزانـی و ڕەفتار دەکات بە پشت بەستن بە هۆکاری کۆمەڵایەتی و ژینگەیی.



نکوڵی لەوە ناکرێت کە زانایانی ئیسلام لەو سەردەمەدا سودی زۆریان لە شارستانی ئیغریقیەکان دیوە بەڵام بەهۆی تێپەربوونی ئەوروپا بەرۆژە تاریك و رەشەکانی ئەو سەردەمەدا کە نەخۆشانی دەرونی دەکوژان و دەسوتێنران ئەستێرەی زانایانی ئیسلام زیاتر دەدرەوشایەوە.

هەندێك نمونەی شێوازی چارەسەرکردن و تێگەیشتنی زانایانی ئیسلام لە نەخۆشی دەرونی:

● لەیەکێك لەبەسەرهاتەکانی رازی کاتێك یەکێك لەمیرەکان توشی نەخۆشی دەبێت و ناتوانێت بروات بەهەموو شێوازێك هەوڵدەدەن لەگەڵی سوودی نابێت رازی دەگاتە ئەو باوەرەی کە هۆکاری نەرۆشتنی میر دەرونیە نەك جەستەیی بۆیە داوا لەمیر دەکات کە دەتوانێت چارەسەری بۆ بکات بەڵام دەبێت دوو ئەسپی باشی بۆ ئامادە بکات و لەگەڵیدا بێت بۆ حەمامکردن کەسوکاری میریش بۆی ئامادەکەن و کاتێك دەیباتە حەمام پاش شێلان بەدەرمان هەڵدەستێتە سەرپێی و هەرەشە لەمیر دەکات بەوەی دەیکوژێت، میریش بەمە زۆر پەست دەبێت هەڵدەستێتە سەرپێ بۆئەوەی پەلاماری بدات رازی رادەکات و بەسواری ئەسپەکە دێتەوە بۆ شار، نامەیەك بۆ میر دەنوسێت و باسی نەخۆشیەکەی بۆ دەکات و پێی دەڵێت ئەوە بەشێك بووە لەچارەسەر بەڵام پاش ئەوە لەروم نایەت خۆم پیشانی میر بدەمەوە، میریش بەرانبەر بەم کارەی خەڵاتی دەکات و موچەی ساڵانەی بۆ دەبرێتەوە. (لە زانستی

ئـــەمرۆدا ئەمـــە پێـــی دەوترێـــت نەخۆشـــی هســـتریا (تەنگـــژەی هەواڵەکراو) کەتاك بەهۆی گرفتێکی دەرونی یان کۆمەڵایەتی، گرفت لــە توانــای جەســتەی دروســت دەبێــت ئــەم شــێوازی چارەســەرە تــا ئێستاش لە هەندێك ناوەند و نەخۆشخانە بەکاردەهێنرێت بـۆ زیـاتر لە نەخۆشییەك.

• نمونەیەکی تری حاڵەتی دەرونـی لەسـەردەمی (هـارون رەشـید، ٧٦٦ز – ٨٠٩ز) یـەکێك لـە جاریـەکانی توشـی حاڵـەتێك دەبێـت کـە دەستی بۆ سـەرەوە بـەرز دەکاتـەوە و ناتوانێـت بیهێنێتـەوە خـوارەوە هارونــە رەشــید بــانگی (جبرائیــل کــوری یەختیشــیوع) دەکــات بــۆ چارەسەری حاڵەتە، ئەویش پێی دەڵێت من چارەسـەری دەکـەم بـەڵام تـا تـەواو دەبم نابێـت لـێم تـورە ببیـت، خەلیفـەش پـەیمانی دەداتـێ، ئەویش دەڵێت کەواتە بۆم بێنە ئێرە لەبەرچاوی هەموان چارەسەری دەکـەم، جاریەکـە دێننــە دیوەخــان و کۆمەڵــە کەسـێك بەدەوریــەوە دەبێـت، جبرائیـل سـەرنزم دەکاتـەوە و هەوڵـدەدات کراسـی جاریەکـە هەڵبداتـــەوە بـــۆ ئـــەوەی ســـەیری جەســـتەکەی بکـــات بەمـــەش کەنیزەکەکە بێزار دەبێت و دەستی دێنێتە خوارەوە بۆ رێگری کـردن لـە هەڵدانـەوەی کراسـەکەی لەوێـدا جبرائیـل دەڵێـت خەلیفـە چـاکم کردەوە، خەلیفەش بە کەنیزەکە دەڵێت ئـادەی دەسـتت سـەروخوار و راسـت و چـەپ بکـە دەبینێـت دەتوانێـت جولـەکان بکـات، ئەمـەش حاڵەتێکی ترس هستریایە کـە زانایـانی ئـەو زەمانـە ئەمـەیان زانیـوە ئێستا هەنـدێك نەشـارەزا لـە دیـن و زانسـت ئەمانـە پیشـانی خـەڵکی

نەشارەزا دەدەن و دەڵێن ئەوە جنۆکە وایلێکردووە و ئێستا چاکی دەکەینەوە زیاتر لە هەزار و دوو سەد ساڵ پێش ئێستا زانایانی ئیسلام هۆکاری ئەم نەخۆشییەیان زانیوە و کاریان پێکردووە ئەمرۆ بازرگانانی ئایین مێشکی خەڵکی فریودەدەن بەناوی جنۆکەوە.

- یەکێکی تر لەو حاڵەتانەی کە زانای بەناوبان ئیبن سینا چارەسەری دەکات کە جەیمس کۆلمان لە کتێبی (Abnormal Psycholog and modern life) باسی دەکات، حاڵەتی نەخۆشێکە کەخۆی لێدەبێت بەمانگا و داوا دەکات سەری ببرن بۆ ئەوەی هەژاران لە گۆشتەکەی بخۆن و دەنگێك دەردەکات وەك دەنگی مانگا، پاش ئەوەی ئیبن سینا رازی دەبێت چارەسەری بکات وەڵامی بۆ دەنرێت کەخۆی ئامادەبکات کەسێك بەرێوەیە بۆئەوەی سەری ببرێت بەمەش نەخۆشەکە تارادەیەك دڵی خۆش دەبێت و خواردنی باش دەبێت. کاتێك ئیبن سینا دێت دەڵێت کوا ئەو مانگایە؟ ئادەی بۆم بێنن باسەری ببرم. نەخۆشەکەش بەشێوە دەنگی مانگا هاوار دەکات و خۆی دەناسێنێت، پاشان ئیبن سینا دەڵێت پاڵی بخەن و دەستو قاچی ببەستنەوە بۆ سەربرین پاش پشکنین دەڵێت ئەم مانگایە لاوازە بەکەڵکی سەربرین نایەت پێویستە خواردنی باش بخوات تا خەڵکی سود لە گۆشتەکەی ببینێت، نەخۆشە بۆ ماوەیەکی باش خواردن دەخوات و ئیبن سینا لەگەڵیدا دەرمانی دەداتی کاتێك کێشی باش دەبێت ئەم وەهمانەی نامێنێت چاك دەبێتەوە.

ئەگەر ئەم حاڵەتە لە رۆژگاری ئەمرۆدا روبدات ئەوە زۆربەی بازرگانای ئایین دەڵێن ئەوە جنۆکەیە یان جادووە بەوە نەبێت چارەسەر ناکرێت بەڵام ئیبن سینا لەو سەردەمەدا دەرك بەوە دەکات

که ئەمە جنۆکە نیە و سحر نیە بۆیە ئەو شێوازە نەزان و نەفامانە بەکارناهێنێت و هاوشێوەی ئەوروپای ئەو کاتەش ناکات ئازاری نەخۆشەکە نادات و بەندی ناکات بەڵکو لەرێی خواردن و چارەسەری دەرونی و هەندێك دەرمانەوە چارەسەری دەکات.

• حاڵەتێکی تر کە ئیبن سینا چارەسەری دەکات لە پەرتوکەکاندا باس دەکرێت کە ئاماژەی گەورەیی و ژیری ئەم زانایەیە کاتێك لاوێك دێنە لای کێشی دابەزیوە و هەست بە بێتاقەتی دەکات، ئیبن سینا گومانی حاڵەتی گرفتی سۆزداری لێدەکات بۆیە لێدانی دڵی بۆ دەگرێت و پرسیاری لێدەکات سەبارەت بە ناونیشان و خۆیان و هەندێك ماڵی نزیك خۆیان و دەبینێت لێدانی دڵی لاوەکە زیاتر دەبێت تا ناوی بنەماڵەیەك دێنێت دەبینێت لەو کاتەدا لێدانی دڵی زۆر خێراتر دەبێت و بەهێنانی ناوی ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە کاتێك ناوی کچەکەیان دێنێت هەست بە گۆرانکاری لە لێدانی دڵ و روخساری گەنجەکە دەکات بۆیە بەکەسوکاری دەڵێت ئەم کورەی ئێوە عاشقە فلانە کەسی بۆ بێنن چاك دەبێت، رەنگە ئەمە بۆ ئەمرۆ ئاسان بێت بەلام هەزار ساڵ پێش ئێستا پزیشکێك بیری بۆ ئەوە بچێت ئەم گۆرانکاری جەستەیی و نەخواردنە هۆکارەکەی دەرونی و کۆمەلایەتییە و بەو شێوە جوان و پڕداهێنە چارەسەری بۆبکات تەنها لەزانایەکی وەك ئیبن سینا دێت، کە رەنگە لەرۆژگاری ئەمرۆشدا هەندێك پزیشك پەی بەو راستتیە نەبەن و دەیەها پشکنین بۆ نەخۆشەکە بکەن و برێکی زۆر دەرمانی بدەنێ و نەزانن بنەمای نیشانە و گرفتەکە چیە؟

• یەکێکی لە نمونە زیندووەکان لەسەردەمی (ئەوحد الزمان) (هبه الله بن علی بن ملك ٥٦٠ کۆچی، کۆچی دوایی کردووە) باس لەوە دەکات کەسێك دێتە لای بەردەوام گلەیی ئەوە دەکات کە گۆزەیەك بەسەر سەریەوەیەوە بۆیە بەهێمنی ئەروات نەك بکەوێتەوە خوارەوە و نایەلێت خەڵکی بەربکەوێت نەك لار ببێتەوە، ئەوحەد زەمان لەگەڵ کاربەدەستەکانی رێك دەکەوێت کە ئەگەر هات یەکێکیان دارێك باسەر سەریدا بەتوندی بجولێنێت بڵێت ئیستا دەی شکێنم و یەکێکی تر لەبەردەستەکانی لەبەرزیەوە گۆزەیەك بەربداتەوە بۆ شکاندن و دەڵێن ئەوە گۆزەکەیە، کاتێك نەخۆشەکە دێت و باسی حاڵی خۆی دەکات، ئەوحەد نکوڵی لە گۆزەکە دەکات بەلام یەکێك لە یاوەرەکانی دەڵێت ئێستا دەیشکێنم من بینیم راستدەکات دەست دەداتە دارێك لەنزیك سەریەوە رایدەوەشێنێت نەخۆشەکە لەترسا چاودەنوقێنێت و کەسی دووەم گۆزەیەك بەردەداتەوە و دەبێت بەچەند پارچەیەکەوە، نەخۆشەکە کە دەبینێت بەراستی گۆزە کەوتۆتە خوارەوە و پارچەی دیارە دەڵێت نەمووت، ئەوەتا رزگارم بوو.

لەو سەردەمەدا نزیکەی (٩٠٠) ساڵ پێش ئێستا زانایانی موسولمان زانیویانە هەندێك حاڵەت هەیە دەرونیەو پێویستی بەوە هەیە بەئاستی عەقلی (زیری) نەخۆشەکە رەفتار بکەی بۆ ئەوەی چاکبێتەوە. هەندێك پزیشك تا ئەمرۆش ئەم شێوازە پەیرەو دەکەن بۆ رۆژگاری ئەمرۆ ئەمە بەسودە یان نا بۆ چ نەخۆشێك دەبێت بۆ چ

نەخۆشێك نابێت ئەوە بابەتێکی تره بەلآم (٩٠٠) سالْ پێش ئێستا ئەم شێوازە بەکارهاتووە و تا ئێستاش بەردەوامە لەهەندێك شوێنی جیهان.

نمونەی ئەم بەسەرهات و شێوازی چارەسەرانە لەدونیای ئیسلامدا زۆرە و هیچ کات ئەم حالەتانە بۆ بوونی جنۆکە و جادوو نەگەرێنراوەتەوە و زانایان هەر لەو کاتەوە شێوازی زانستی و ژیریان بەکارهێناوە، بەلآم لەرۆژگاری ئەمرۆدا هەندێك هەلْپەرست و بازرگانی ئایین خەلْکی سادە و ساویلکە و نەشارەزا لە ئایین و زانست فریودەدەن بەناوی ئایینەوە رەفتارەکانی ئەو کەسانە لەسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەژمارناکرێت چونکە ئەوانە کەمینەن و هیچ کات نابنە نوێنەری زانست یان ئایین، ئەمرۆ بێت یان سبەی فرت و فێلیان و نەزانیان بۆ خەلْکی دەردەکەوێت.

### بەناوبانگترین زایانی ئەو کاتە :

● رازی: (٨٥٤ – ٩٣٣ ز) زۆر بایەخی دەدا بەلایەنی فسیۆلۆژی و لەو باوەرەدا بوو نەخۆشی بەهۆی هۆکاری فیزیای و گۆرانکاری کیمیاییەوە رودەدات و دەبێت هۆکارەکەی بزانرێت لەرێی چاودێریکردنەوە لەنەخۆشخانە، بەمەش گرنگترین بنەمای پزیشکی دانا کەبریتیە لە سێ تەوەر (نەخۆش و پزیشك و ژینکە (ناوەندی چارەسەر).



● ئـیبن سـینا: (٩٨٠ – ١٠٣٧ز) یـەكێك بـووە لـە پزیشـك و نەشتەرگەرە بەناوبەنگەكان، زمانی (یۆنانی و رۆمانی و عبری و عـــەرەبی) زانیـــوە بۆیـــە توانیویـــەتی ســـود لـــە زۆربـــەی شارســـتانیەتیەكان وەرگرێـــت، زیـــاتر لـــە (٦٠٠) پزیشـــك لەسەردەستی فێری پزیشكی بوون و راهێنانی بەزیاتر لە (٣٠٠٠) پزیشك كردووە، بۆیە پێیان دەوت (میری پزیشكان).

زیاتر لە (١٠٠) نوسراوی هەیـە گرنگترینیـان پـەرتوكی (یاسا – القـانون)ە كەبـــە سەرچـاوەیەكی زانسـتی گـرنگ دادەنـــرا لەسـەرجەم ئـەوروپادا بـۆ مـاوەی نزیكـەی (٦٠٠) سـاڵ، هـەروەها كتـێبی شـیفا و كتێبـی رزگـاربوون گرنگـی تایبـەتیان هـەبووە لەكاتی خۆیدا.

داهێنانـــەكانی لـــەبواری نەخۆشـــیە دەرونیـــەكان گرنگـــی بەرچاوی هەیـە لەمێـژوی نەخۆشـیە دەرونیـەكان، یەكـەم كـەس بـوو باسـی لـەهۆكاری دەرونـی كـرد لەدروسـتبونی نەخۆشـی دەرونـی، بایـەخی گـەورەی بـە زانسـتی سایكۆسـۆماتیك دەدا كـــەهۆكاری هەنـــدێك نەخۆشـــی جەســـتەیی بـــۆ دەرونـــی دەگەڕاندەوە.

یەكـەم زانـا بـووە شـێوازی شـیكارە دەرونـی بـەكارهێناوە كـەدواتر لەلایـەن فرۆیـدەوە بـاس كـراوە، هـەروەها شـێوازی ئاخاوتنی ئازاد (التداعی الحر) بـەكارهێنا و گرنگی بـە هۆكاری بۆماوە دەدا بەڵام هۆكاری ژینگەشی پشتگوێ نەدەخست.

ئیبن سینا دژی جیاکردنەوەی نەخۆشانی دەروونی بوو لە ناوەندی چارەسەردا و نەشتەرگەری بۆ گەلێك نەخۆشی دەروونی کردووە سەرکەوتنی بەرچاوی تۆمارکردووە،

لەو سەردەمەدا برێکی زۆر لە نەخۆشخانە دەروونی و جەستەییەکان پێکەوە بوون لەبەر باوەری پتەوی بەوەی پەیوەندیەکی گەورە هەیە لەنێوان جەستەو دەروندا.

زیاتر لە شێوازێکی لەچارەسەردا بەکاردەهێنا (نەشتەرگەری، سستمی خواردن، حەمام و شێلان، دەرمان، راهێنانی دەرونی، گۆرینی ژینگە، چارەسەری ڕەفتاری).

- ئیبن روشد: (١١٢٦ – ١١٩٨ ز) جیاکاری کرد لەنێوان نەخۆشی دەرونی کورت خایەن و درێژخایەن، هەروەها باسی لەهەردوو هۆکاری دەرونی و ژینگەیی دەکرد لەدروستبوونی نەخۆشی.

سەدە تاریکەکان لە ئەوروپا: بە نەمانی هەردوو شارستانی یۆنانی و رۆمانی تاریکی باڵی بەسەر سەرجەم بوارەکانی زانستدا کێشاو جارێکی تر هۆکاری نەخۆشی بۆ شەیتان و روحە شەنگێزەکان گەرێندرانەوە وچارەسەری تاك بریتی بوو لەرزگارکردنی لە شەیتان و روحە خراپەکان

لەمێژە مرۆڤ هەست بەوە دەکات پەیوەندییەکی ئەرێنی هەیە لەنێوان دەرون دروستی و لایەنی باوەرداری، لەم چەند ساڵەی دواییدا زۆربەی توێژینەوەکان ئەو راستە دەسەلمێنن کە ئەوانەی لایەنی ئیمانیان و پەیوەست بونیان بە ئایینەوە هەیە (هەر ئاینێك بێت ئیسلام، مەسیحی، جولەکە،...) رەنگە یەکێکیان لەوی تریان کاریگەری زیاتر ببێت بەڵام سەرجەمیان دەبنە مایەی ئاسودەی تاك و هەستی ئارامی لەناخدا.

کۆیین ((Koenig باس لەوە دەکات (٥٠٠) توێژینەوە لەکۆی (٧٠٠) توێژینەوە کەپێش ساڵی (٢٠٠٠) کراوە، لە (٧١٪) باس لە پەیوەندی نێوان دەرون دروستی و باوەرداری دەکات.لەکۆی (٩٣) توێژینەوە (٦٠) دانەیان ئاماژە بەوە دەدەن ئەوانەی لایەنی باوەرداریان بەرزە کەمتر توشی خەمۆکی دەبن و ئەگەر توش ببن لەماوەیەکی کەمتردا چاکدەبنەوە.

بەپێی توێژنەوەیەك لە کەنەدا کراوە لەسەر (٣٧.٠٠٠) تاك لەسەر پەیوەندی باوەرداری بە خەمۆکیەوە ئەنجامەکەی ئاماژە بەوە دەدات هەتا پەیوەستبوون بە ئایینەوە زۆربێت ئەگەری خەمۆکی و ترسی کۆمەڵایەتی کەمترە.

Baetz, M. R. et al. (2006). How spiritual values and worship attendance relate to psychiatric disorders in the Canadian population. Canadian journal of psychiatry, 51 (10), pp. 654-657



توێژەران هۆکاری ئەمە بۆ ئەوە دەگێرنەوە گیانی هەرەوەزی لەنێوان ئەو کۆمەڵانەی کەباوەردارن زیاترە لە کۆمەڵەیەکی تر، ئەم هاوکاری و هاوسۆزیە تەنها لەبواری دوعاکردن و هاوسۆزی نیە بەڵکو لەرووی دارایشەوە هاوکاری یەکتر دەکەن، بۆیە هەستی نەرێنی گۆشەگیری و لاوازی و نەبوونی گەشبینی و ناڕوونی ئامانج لای بڕواداران کەمترە بەتایبەتی کە روونە یەکێك لە هۆکارەکانی خەمۆکی هەستکردن بە تەنیای و دابرانە لە کۆمەڵگە.

Kennedy, G. J. et al. (1996). The relation of religious preference and practice to depressive symptons among 1,855 older adults. Journal of gerentology, 51b (6), p. 306;

Westgate, C. E. (1996). Spiritual wellness and depression. Journal of counseling and development. 75, p. 31

لەکۆی (٦٨) توێژنەوە (٥٧) ئاماژە بەوە دەدەن باوەرداران کەمتر هەوڵی خۆکوشتن دەدەن و سەرژمێریەکانی رێکخراوی تەندروستی جیهانی بەراوردی وولاتانی رۆژئاوا بە رۆژهەلات ئەو جیاوازییە بەئاشکرا دەبینرێت بڕوادار و بێباوەر، لە نێوان ئایینی مەسیحی و ئیسلام، تەنانەت لە نێوان هەردوو مەزهەبە جیاکەی مەسیحیەت. کە دورکایم ئاماژەی پێدەدات لە نێوان کاسولیکەکان کەمترە بە بەراوورد بە پرۆتستانتەکان. (لەبابەتی خۆکوشتن باس لەوە کراوە داتای گەلێك وولات خراوەتە روو). لە توێژینەوەیەکدا ئاماژە بەوە دەدات ئەوانەی سەردانی کەنیسە

ناکەن خۆکوشتن لە نێوانیاندا چوار هێندەی ئەوانەیە کەسەردانی کەنیشە دەکەن.

Weaver, A. J. & H. G. Koenig. (1996). Elderly suicide, mental health professionals, and the clergy: a need for clinical collobation, training, and research, p. 502;

Commerford, M. C. & M. Reznikoff. (1996). Relationship of religion and perceived social support to self-esteem and depression in nursing home resident. The Journal of psychology, 130 (1), p. 43.

له تویژنەیەك لە بەریتانیا كراوە لەسەر (٤٠) لاوی هندوسی و (٦٠) لاوی موسولمان دەرکەوتووە موسمانەکان کەمتر بری خۆکوژیان بەهۆی ئەوەی لە ئاینی ئیسلامدا خۆکوشتن حەرامکراوە. (Loewenthal and Kamal)

Psychological measure of Islamic Religiousness

لەکۆی (٦٩) توێژینەوە (٣٥) باس لەوە دەکەن ئەگەری دڵەراوکێ لە کەسانی باوەرداردا کەمترە لە کەسانی بێباوەر.

لەکۆی (٧) توێژینەوەی کلینیکی (٦) دانەیان ئاماژە بە کەمتر توشبوون بە دڵەراوکێ دەدات لەنێوان برواداراندا.

Koenig, H. G. (2002). Religion and medicine II: religion, mental health, and related behaviors. International journal of psychiatri in medicine. 31 (1), p. 100

توێژینەوەکانی کروفورد و هاندال و فاینر هەمان راستی دەردەخەن کەسانی پەیوەستدار بە ئایینەوە کەمتر توشی دڵەراوکێ دەبن بەبەراورد بەوانەی کەمتر پەیوەستی ئایینن.

لە کۆی (١٢٠) توێژنەوە (٩٨) ئاماژە بەوە دەکەن بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر لە برواداراندا کەمترە (دەتوانیت

بڵێی لە بروادارانی ئاینی ئیسلامدا هەر زۆر کەمە بەراوورد بە کەسانی تر).

لەکۆی (١١٤) توێژینەوە (٩٤) باس لەوە دەکات بروادارەکان لەرووی دەرونیەوە باشترن و زیاتر ئومێدیان بە ئایندە هەیە و گەشبینن.

لەکۆی (١٦) توێژینەوە (١٥) ئاماژە بەوە دەدات کەسانی بروادار واهەست دەکەن ژیانیان واتادارەو ئامانج و خەونەکانیان زیاتر دێتەدی.

لەکۆی (٣٨) توێژینەوە (٣٥) ئاماژە بەوە دەدات کەسانی باوەردار لە ژیانی هاوسەریاندا شادمانترن و مامەڵەیان باشترە لەگەڵ هاوژینەکانیان.

لەکۆی (٢٠) توێژینەوە (١٩) باس لەوە دەکات پاڵپشتی کۆمەڵایەتی لەکەسانی باوەرداردا زیاترە،

لە یەکێك لە توێژینەوەکانی ئالان بیرگن کەساڵی (١٩٨٣) پێ هەڵساوە بە شیکردنەوەی ئەنجامی (٢٤) توێژینەوە کە باس لە پەیوەندی ئایین و دەرون دروستی دەکات دەرئەنجام بەو جۆرە بوو

٤٧٪ ی توێژینەوەکان پەیوەندیەکی ئەرێنی هەیە لەنێوان ئایین و دەرون دەروستی.

٢٣٪ پەیوەندیەکی نەرێنی هەیە.

٣٠٪ نەبوونی پەیوەندی

**وەك روونــە زۆربــەی توێژینــەوەكان بــاس لــە پەیوەنــدی ئەرێنی دەكەن. هۆكاری ئەو جیاوازیەش بۆ جیاوازی پێوەرەكان دەگەرێتـەوە و شـێوازی هەڵسـەنگاندنی رەفتارەكـانی تـاك. بۆیـە ئەگەر تەندرروستی دەرونی نەبوونی نەخۆشی و بەكارنەهێنانی مــادەی هۆشــبەر و خۆنەكوشــتن و بــوونی گیــانی هاوكــاری و كۆمەڵایــەتی بێــت ئــەوە گومــانی تیانیــە كەســانی بــروادار تەندروستیان باشترو و پتەوترە.**

**هــاكنی و ســـاندرز (Hackney and Sanders) لـــە شـیكردنەوەی (٣٤) توێژنـەوەدا لـەنێوان سـاڵانی (١٩٩٠ — ٢٠٠١) كـراوە تێبینــی پەیوەنــدی ئــەرێنیان كــردووە لــە نێــوان ئــایین و دەرون دروستی.**

**لە شیكردنەوەی (٢٠) توێژینەوە لە سالانی (١٩٩٨ — ٢٠٠٤) كـراوە لەسەر كاریگەری نێوان دینـداری و دەرون دروسـتی لـە هەرزەكارانـدا تێبینی كراوە پەیوەندییەكی ئەرێنی هەیە.**

**لــە توێژنەوەكــەی (رشــاد محمــد موســی) تێبینــی كــراوە ئــەو خوێندكارانەی لایەنی دینداریان پتەوە كەمتر نیشانەكانی خەموكیان تیابەدەردەكەوێت.**

تیبینــی: بەشــێكی زۆری سەرچــاوەكانی ئــەم بەشــە لــە پــەرتوكی (التدين والصحة النفسية) د. ئـازاد علـی اسماعیـل وەرگـیراوە. لەگـەل ووتارێكی د. طارق بن علی حبیب.

# بەشی شەشەم

هەندێك لە نەخۆشییە دەروونیەكان و چارەسەریان لە ئیسلامدا

- تورەیی
- خەمۆكی
- وەسواسی
- دڵەراوكێی گشتی
- توندوتیژی لەسەر بنەمای رەگەز
- ئایا پێغەمبەر لە هاوژینەكانی داوە؟
- میراتگری لە ئیسلامدا توندوتیژی داراییە؟
- ئالوودەبوون
- خۆكوشتن
- فشار و كاریگەری دەرونی.

## توڕەیی ﴿ هەڵچوونی دەرونی﴾

کێ هەیە لەئێمە ڕۆژێك لەڕۆژان تورە نەبوبێت یان توڕەیان نەکردبێت.

چەندمان لەکاتی توڕەییدا دەتوانین کۆنترۆڵی خۆمان بکەین و قسەیەك یان ڕەفتارێك نەکەین کەدواتر لێی پەشیمان نەبین.

لای هەندێك توڕەیی بەجۆرێك لەئازایەتی دادەنرێت و لای هەندێکی تر نیشانەی پیاوەتی و خۆهەڵکێشانە کەتاکێکی توڕەیە و لای هەندێکی تر ڕەفتارێکی شەرمەزارییانەیەو بەشوێن چارەسەردا دەگەرێت بۆی، لای هەندێکی تر نیشانەی بێدەستەلاتیە.

هەندێك توڕەبونەکەی لەناخی خۆیدا دەخواتەوە و ناتوانێت یان ڕێگەی نادرێت دەریبڕێت و هەندێکی تر بەهاوار و قیژە توڕەییەکەی دەردەبڕێت و کەسانێك هەن بەووتەی نەشیاو و توندوتیژی و ئازاردانی خود یان بەرامبەر یان زیان گەیاندن بەکەرەستەی ناوماڵ توڕەییەکەیان دەردەبڕین.

کەسانێکیش هەن بەزیان گەیاندن بەسەروەت و سامانی گشتی (شکاندنی درەختی سەر شەقامەکان و وێستگەی پاسەکان و بەلوعەی تەوالێتەکان) توڕەیی و نارەزایی خۆیان نیشان دەدەن.

هۆکاری توڕەبون:

دەتوانین بڵێین دوو هۆکاری سەرەکی هەیە بۆ توڕەبوون:

هۆکاری دەرەکی:

- قەرەباڵغی و گرفتی هاتوچۆ.

- پیس بوونی ژینگە و دەنگەدەنگی زۆر و بەرزبونەوەی پلەی گەرما.
- کێشەی خێزانی یان دارایی.
- فشاری کار و نەگونجاندن لەگەڵ ناوەندی کار.
- ستەم و زۆرداری لێکردن و نایەکسانی و نادادپەروەری لەبوارەکانی ژیاندا...هتد.

هۆکاری ناوەکی: پەیوەندی بەخودی تاکەوە هەیە وەکو

- بێخەوی بەهەر هۆکارێك بێت نەخۆشی یان ناخۆشی.
- برسێتی
- ئازار، هەر شوێنێکی جەستە ئازاری هەبێت دەبێتە هۆی بێزاری و هەندێکجار تورەیی.
- گرفتی سوڕی مانگانە، نەمانی سوڕی مانگانە (لەهەر تەمەنێکدا بێت ئەگەر ئەو نەمانە نەخواستراوبێت).
- نەخۆشی بەتایبەتی ئەگەر چارەسەری ئاسان نەبێت و درێژخایەن بێت و کاریگەری لەسەر شێوازی ژیان هەبێت و لەهەندێك بواردا چالاکی تاك سنوردار بکات.
- بەکارهێنانی ئەلکحول و مادەهۆشبەرەکان یان هەوڵدان بۆ وازهێنان ئەگەر تاك ئالودەبێت.
- بونی حاڵەتێك یان نەخۆشییەکی دەرونی وەکو خەمۆکی ودڵەراوکێ و سکیزۆفرینیا.

## نیشانەکانی توڕەیی:

تاکەکان جیاوازن لەشێوازی دەربرینیان بۆ توڕەیی بۆیە دەشێت هەندێك نیشانە لەتاکێکدا هەبێت و لەیەکێکی تردا نەبێت و بەپێی هۆکاری توڕەبونەکە و شوێنی توڕەبون و ئەو کەسەی لێی توڕەدەبیت دەربڕینت بۆ توڕەبون دەگۆڕێت.

ئاشکراترین نیشانەکان بریتین لە:

خێرا لێدانی دڵ و بەرزبونەوەی فشاری خوێن و سوربونەوە و هەناسە کورتیێ.

لەرزین، گرژبونی ماسولکەکان، عەرەقکردنەوە، ئاخاوتن بەدەنگی بەرز و رەخنەگرتن و قسەی نەشیاو و زیان گەیاندن بەخود یا بەدەوروبەرو خێرایی و توندوتیژی لەرەفتاردا.

بێدەنگی و خۆ بەدووورگرتن. گرفت لەنوستن و خواردن و پەیوەندی سێکسی.

## بەپێی شێوازی دەربڕین توڕەبوون دەکرێت بە حەوت جۆرەوە:

١- هەندێك تەنها لەناخی خۆیدا توڕەییەکەی دەهێڵێتەوە و رەفتاری سلبیانەی دەبێت بەرامبەر بەژیان و ئاستی کار و چالاکی دادەبەزێت.

٢-تەنها شوێنەکە بەجێدێڵێت وەك نارەزاییەك.

٣- هەندێك بەشێوەی زارەکی توڕەییەکەیان دەردەبڕن و دەنگ بەرزدەکەنەوە و هاوار دەکەن بەبێ ئەوەی وتەی نەشیاو بەکاربهێنن.

٤- لەهەندێکدا کۆنترۆڵی زارەکی خۆیان لەدەست دەدەن و وتەو ڕستەی نەشیاو بەکاردێنن کەدواتر ڕەنگە لێی پەشیمان بن یان سووربن لەسەر ڕەفتارەکەیان.

٥- کەسانێك هەن دەگەنە ئەو ئاستەی زیان بەخۆیان یان کەرەستەی شوێنەکە دەکەیەنن وەك پەرداخ شکاندن، کورسی شکاندن، شکاندنی ئاوێنە،... هتد.

٦- توندوتیژی نواندن بەرامبەر بەکەسانی تر، برینندار کردن یان تەنانەت تا ئاستی کوشتنی کەسێك یان زیاتر لە کەسێك.

٧-زیان گەیاندن بەخودو خۆکوژی.

بۆ هەندێك زوو توڕەدەبن و هەندێکی تر بەپێچەوانەوە؟

د. جیری دیڤینباتشەر پسپۆر لەبواری بەڕێوەبردنی توڕەییدا هۆکاری ئەم حاڵەتە بۆ سێ هۆکاری سەرەکی دەگەڕێنێتەوە:

I. هۆکاری بۆماوە و فسیۆلۆجی.

II. تێڕوانینی تاك و خێزان بۆ توڕەیی و پەروەردەکردنی تاك لەسەر ئەو شێوازە.

III. هۆکاری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری. هەندێك کۆمەڵگە بەشێوازێکی ئەرێنی دەڕوانێتە تاکی توڕە ئەمەش وا دەکات تاك توڕەبون بەشتێکی ئیجابی وەرگرێت و جاربەجار هەوڵبدات خێراتر و توندتر توڕە ببێت.

چارەسەری توڕەیی:

**زۆرێك لەئێمە ئەو گرفتەی هەیە ناتوانم خۆم كۆنترۆڵ بكەم. لەكاتی توڕەییدا چی و كێم لەبەردەستدا بێت زیانی پێدەگەیەنم، تەرو ووشك پێكەوە دەسوتێنم، گەورەو بچوكیم لا نامێنێت.**

گەلێك ڕێگە چارە هەیە بۆ توڕەیی گرنگترینیان بریتین لە:

١- ڕاهێنانی خۆخاوكردنەوە:

**لەڕێگەی هەناسەی قوڵ و بەهێواشی بەهۆی ناوپەنچكەوە چونكە هەناسەی خێرا و كورت لەڕێگەی سیەكانەوە ئارامیت پێنابەخشێت.**

**تێفروسماندن(ایحاء) بەهەندێك پەیف و وێنەی جوان و بیرەوەری خۆش و ئارام بەخش.**

**دەبێت تاك پێشتر ئەم ڕاهێنانە بكات تاكو بتوانێت لەكاتی توڕەییدا دوبارەی بكاتەوە.**

٢- بونیادنانی هزری:

**هەوڵبدە شێوازی بیركردنەوەت بگۆڕیت بۆ نمونە لەبری ئەوەی بڵێت (دەبێت ئەو شتەم دەستكەوێت) بۆ ئەوەی بڵێیت (هەوڵدەدەم ئەو شتەم دەستكەوێت). خۆت بپارێزە لەووشەی هەرگیز و قەت و بەهیچ جۆرێك، چونكە ئەو ووشانە كلیلی داخستنی چارەسەرەكانە و بوار نادەیت كەسانی تر هاوكاریت بكەن لەچارەسەردا.**

دڵنیابە تورەبونت هیچ لەشتەکان ناگۆڕێت بەڵکو زیاتر ماندوت دەکات و گرفتەکان قولتر دەکاتەوە و ووزە و تواناکانت بەهەدەر دەبات. بۆ نمونە کاتێك منداڵەکەت بەبێ مەبەست کارێکی هەڵە دەکات وەکو ئەوەی شتێك بەتۆدا دەرژێنێت لەکاتی خۆئامادەکردنی بەیانیان بۆ چونە سەرکار تۆ لەبەردەم دوو بژاردەی

یەکەم: خۆت لە منداڵەکە تورە بکەیت و هەندێك قسەی نەشیاوی پێبڵێت و لەهەمان کاتدا برێك خۆت لە دایکی تورە بکەیت کەبۆ ئەو شتەی لەو شوێنەدا داناوە کە منداڵەکە بیرژێت بەتۆدا و دواتر بچیت خۆت بگۆڕیت و بێزاری بۆ خۆت و منداڵ و خێزانەکەت دروست بکەیت هەموو رۆژەکەت بە بێزاری دەست پێکەیت و تا دەگەیتە شوێنی کارەکەت بەردەوام لەناخەوە هەڵچیت و لە ترافیکدا بەتورەیی لێخۆرین بکەیت و بێزاری دەربریت و لەشوێنی کار نیشانەی بێزاری و تورەییت پێوەدیاربێت واتە هەموو ڕۆژەکەت بە نەرێنی دەست پێکەیت.

دووەم: خۆت پۆزشێك بۆ منداڵەکە بهێنیتەوە و بڵێت قەیناکە هیچ نیە ئێستا چارەسەری دەکەم و خۆم دەگۆڕم جارێکیتر بە ئاگابە لەوەی خۆت یان کەسێکی تر نارەحەت نەکەی.

٣. چارەسەری گرفت:

هەموو تورەبونێك هۆکارێکی ئاشکرا یان شاراوەی هەیە بەپێی هۆکارەکەی دەتوانین رێگاچارە یان گەلێك رێگاچارە دابنێین بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێمە لەو باوەڕەدا بین کەهیچ گرفتێك نیە چارەی

نەبێت و هەمیشە هەوڵدان بۆ چارەسەر لەهێشتنەوەی گرفتەکان بەکەڵەکە بوویی باشترە.

٤- هونەری پەیوەندی و بەردەوام بوون:

تاك لەکاتی تورەیدا تەنها گوێ لەکورتەی بابەتەکان دەگرێت و بڕیاری خۆی دەدات لەکاتێکدا واباشە خۆمان ڕابێنین برێك گوێ لەدرێژەی هۆکارەکان بگرین تاکو بڕیاری دروست بدەین.

٥- گاڵتەجاری:

هەندێکجار وا پێویست دەکات کاتێك بابەتێك زۆر بێزارت دەکات بەهەندێك نوکتە و قۆشمەبازی و گاڵتەجاری هەستی خۆت دەربریت تاکو هێندە فشارت بۆ دروست نەبێت بەڵام ئەمە نابێت تاکە ڕێگە بێت بەڵکو سەرەتایەکە بۆ ئەوەی خۆت بەدوور بگریت لەتوڕەیی و پاشان ڕێگا چارەی گونجاو بۆ حاڵەتەکە دیاری دەکەیت.

٦- گۆڕینی ژینگە:

بەیەکێك لەتەکنیکە گرنگ و سەرکەوتوەکان دادەنرێت بەتایبەتی لەسەرەتای توڕەبووندا بەوەی ئەو شوێنە بەجێ بهێلیت و یان خۆت بەچالاکیەکی ترەوە سەرقاڵ بکەیت بۆ ماوەیەك لەگرفتەکە خۆت بەدوور بگریت و دواتر بەشوێن چارەسەردا بگەرێیت.

٧- پشودان بۆ ماوەیەك:

هەریەك لەئێمە بەهۆی فشاری بەردەوامی کار و ماڵ و سەرقاڵیەکانی ژیانەوە هەست بەماندوێتی دەکات ئەگەری توڕەبونی زووتر دەبێت بۆیە واباشە تاك ماوەیەك بۆ پشوو دابنێت وەکو

ئەوەی هەفتەی زیاتر لەڕۆژێك پشو بەخۆی بدات یان ڕۆژانـە مـاوەی چـەند خولـەكێك دابنێـت بـۆ بـەخۆدا چـونەوە بەتایبـەتی كاتێـك لەئـەركی دەرەوە دەگەڕێیتـەوە بـۆ ماڵـەوە بڕیـاری ئـەوەت دابێـت كەچوویتەوە بـۆ ماڵەوە بـۆ مـاوەی (١٠ – ١٥) خولـەك هـیچ نەكـەیت جگە لەپشودان بەتایبەتی خانمان تـاكو شـەكەتی و مانـدوێتی دەرەوە بەتوڕەبوون لەمنداڵەكەت دەرنەبڕیت.

٨- سەردانی پزیشك و چارەسازی دەروونی:

بۆ چارەسەركردنی هۆكار توڕەبون بەتایبەتی ئەگەر هۆكارەكەی پەیوەندی بەنەخۆشی دەرونی یان گرفتی خێزانیەوە هەبێت.



## ئیسلام چۆن چارەسەری تورەیی کردووە:

١- پەناگرتن بە خوا لە شەیتان:

**لە فەرموودەیەکدا کە هەردوو ئیمامی ( بوخاری و مسلیم) روایەتیان کردووە کاتێك دوو کەس دەبێتە دەنگە دەنگیان و یەکێکیان سوور بۆتەوە و خوێنهێنەرەکانی دەم وچاوی دەرکەوتوو، پێغەمبەر (د.خ) دەڵێت من شتێك دەزانم ئەگەر بیلێت ئەو حاڵەتەی لەسەر نامێنێت، ئەگەر بڵێت پەنادەگرم بەخوا لە شەیتان.**

"عن سليمان بن صرد قال: كنت جالسا مع النبي صلى الله عليه وسلم، ورجلان يستبان، فأحدهما احمرَ وجهه وانتفخت أوداجه ( عروق من العنق) فقال النبي صلى الله عليه وسلم: إني لأعلم كلمة لو قالها ذهب عنه ما يجد، لو قال أعوذ بالله من الشيطان ذهب عنه ما يجد" (رواه البخاري، الفتح ٣٣٧/٦ ومسلم/٢٦١٠)

٢-هەڵبژاردنی بێدەنگی:

**بە یەکێك لە رێکارە هەر گرنگ و باشەکان دادەنرێت چونکە مرۆڤ کاتی تورەیی دەشێت هەندێك وشەی نەشیاو بڵێت کە دواتر لێی پەشیمان بێتەوە و هەندێك کات رەنگە ببێتە زیان گەیاندنی گەورە بە تاك و خێزان تا رادەی هەڵوەشانەوەی خێزان لەکاتی بەکارهێنانی زاراوەی تەلاق. بۆیە پێغەمبەر ﷺ(د.خ)ﷺ دەفەرموێت ( ئەگەر یەکێکتان تورەبوو با بێدەنگ بێت) " إذا غضب أحدكم فليسكت". (رواه الإمام أحمد المسند ٣٢٩/١).**

٣-ئارامی و کەمکردنەوەی جولە:

پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت ئەگەر کەسێکتان تورەبوو ئەگەر بە پێوەبوو با دانیشێت ئەگەر تورەییەکەی نەڕۆیی با پاڵکەوێت دیارە مەبەست لەم فەرمووده گرنگە بۆ کەمکردنەوەی زیانە بۆیە کاتێك تاك بە پێوەبێت ئەگەری زیانی گەیاندنی بە دەوروبەر هەیە بە دەستەکانی و بە پێکانی و جگە لەوەی ئەگەر هەیە بچێت لە شوێنێکی تر کەرەستەی زیان گەیاندن بهێنێت بەڵام ئەگەر دانیشت بەشێکی زۆری ئەو مەترسیە کەمدەبێتەوە بەڵام هێشتا ئەگەری زیان گەیاندنی هەیە بۆیە ئەگەر بەوەی هێور نەبوەوە ئەوە با پاڵکەوێت یان بکەوێتە سەرتەنیشت..

"إذا غضب أحدكم وهو قائم فليجلس، فإن ذهب عنه الغضب وإلا فليضطجع (مسند احمد ١٥٢/٥).

٤- لە فەرمودەیەکی تردا هانمان دەدات کە کۆنترۆلی تورەییەکەی خۆمان بکەین و پێمان دەڵێت جوامێر و ئازا ئەوە نیە کە تورەیە و سووردەبێتەوە بەڵکو ئازا و جوامێر ئەوەیە کە خۆی کۆنترۆل دەکات لەساتی تورەییدا. " ليس الشديد بالصرعة، إنما الشديد الذي يملك نفسه عند الغضب" (رواه أحمد ٢٣٦/٢ والحديث متفق عليه).

٥- پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ بە کردەوە نیشانمان دەدات کە بەرانبەر بەوانەی تورەدەبن لێمان چۆن بین کاتێك عەرەبێکی دەشتەکی پەلاماری دەدات و ملی کراسەکەی هێندە توند دەگوشێت کە شوێنەواری بەلای ملی پێغەمبەرەوە دەردەکەوێت پێ دەڵێت: لەو

ماڵەی خوا پێی بەخشیویت بەشم بدە، پێغەمبەریش لێی تورە نابێت فرمان دەکات بەشی بدەن.

"عن انس بن مالك كنت أمشي مع رسول الله وعليه برد نجراني غليظ الحاشية، فأدركه أعرابي فجبذه بردائه جبذة شديدة حتى نظرت الى صفحة، عاتق النبي قد أثرت به حاشية الرداء من شدة جبتة، ثم قال: يا محمد، مر لي من مال الله الذي عندك، فالتفت اليه رسول الله فضحط، ثم أمر له بعطاء". ( البخاري و مسلم)

٦- قورئان هانمان دەدات بۆ ئەوەی لەکاتی تورەییدا کەسێکی لێبوردە بین و رق و تورەیی لە سنگمان لابەرین و تەنانەت بەخشندەبین بەرانبەر بەوانەی کە تورەمان دەکەن.

﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ" ﴿١٣٤-ال عمران﴾

له راڤەی ئەم ئایەتەدا باس لەوە دەکرێت یەکێك لە پیاوچاکان کەنیزەکێکی دەبێت و لەکاتێکدا خواردنی بۆ دێنێت شلەکەی پیادا دەرژێت، ئەو کەسە دەیەوێت تورەبێت بەڵام کەنیزەکە پێی دەڵێت گەورەم بە پێی قورئان رەفتار بکە ﴿والکاظمین الغیظ﴾ ئەوانەی رقیان دەخۆنەوە دەڵێت ئەوە رقەکەم (تورەییەکەم) خواردەوە، ئەوانەی لێبوردەن بەرانبەر بە خەڵکی دەڵێت ئەوە لێت خۆش بووم، پێی دەڵێت خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت دەڵێت لەبەر خوا ئەوە ئازادم کردی (بروانە ئەم بەسەرهاتە جوانە لەکاتی هەڵەی کەسێك لەبری تورەبوون و هەڵچون و زیان گەیاندن، ئارامی و

لێخۆشبوون و پاداشت دانەوە) ئەم بەسەرهاتە زیاتر لە هەزار ساڵە باس دەکرێت بەڵام ئەگەر ئەم کەسە تورەبوایە ئازاری ئەو کەنیزەکەی بدایە هیچی دەست نەدەکەوت بەڵکو زیانی دەرونی و جەستەی بەخۆی دەگەیاند پێش کەنیزەکەکە، بەڵام ئەوە زیاتر لە هەزار ساڵە کەسانێکی زۆر بەهۆی ئەو بەسەرهاتەوە لەهەڵەی کەسانی بەرانبەریان دەبورن و بەخشندەن لەگەڵیان. ﴿وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ﴾ (٣٧ الشوری) ئەوانەی خۆیان دەپارێزن لە گوناهی گەورە و تاوان و لەکاتی تورەبوندا لیبوردەن.

٧-پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ و داوای لێکرد کە ئامۆژگاری بکات، ووتی: تورە مەبە، چەند جارێك دووبارەی کردەوە کە ئامۆژگاریم بکە هەر پێی دەوتەوە تورە مەبە.

"أن رجلاً قال للنبي صلى الله عليه وسلم أوصني فقال: لا تغضب فردد مراراً فقال: لا تغضب " رواه البخاري.

٨- دەستنوێژگرتن: دیارە لەو کاتەدا ئەگەر تاك بتوانێت دەست نوێژ بگرێت کاریگەری زۆری هەیە لەسەر هێوربونەوە و کەمبونەوەی زیان گەیاندن. " إذا غضب أحدكم فليتوضأ فإنما الغضب من النار " أخرجه أبو داود" ( ئەگەر یەکێك لە ئێوە تورەبوو با دەستنوێژ بگرێت تورەیی لە ئاگرەوەیە).

٩-کاتێك کەبەرۆژ دەبین فرمانمان پێدەکات تورە نەبین و ئەگەر کەسێکیش هەڵەی بەرانبەرمان کرد بڵێین بەرۆژم.

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: "إذا كان يوم صوم أحدكم فلا يرفث، ولا يصخب، فإن سابه أحد، أو قاتله، فليقل إني امرؤ صائم". (متفق عليه)

**١٠- مژدەی بەهەشت: سەرمرای گرنگی و سودەکانی تورمنەبوون لەفەرمودەیەکدا پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەفەرموێت: کاتێک ئەبو دەردا پێی دەڵێت شتێکم فێرکە پێی بچمە بەهەشتەوە پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ پێی دەڵێت (تورە مەبە)**

عن أبي الدرداء رضي الله عنه قال: "قلت يا رسول الله دلني على عمل يدخلني الجنة" قال: "لا تغضب"(البخاري ٦١١٦،

**لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت ئەوەی لەبەر خوا رقی بخواتەوە کەتوانای جێبەجێکردنی تورەییەکەی هەبێت لەرۆژی قیامەتدا خوای بالادەست بانگی دەکات لەسەر بونەوەرەکانەوە و پێی دەڵێت بەئارەزووی خۆت لە فریشتەکان هەڵبژێرە.** "من كظم غيظاً وهو قادر على أن ينفذه، دعاه الله عز وجل على رؤوس الخلائق يوم القيامة حتى يخيره من الحور العين ماشاء" (رواه أبو داود ٤٧٧٧ وغيره، وحسنه في صحيح الجامع ٦٥١).

**١١ کاریگەری نەرێنی لەسەر باوەر کاتێک ئامۆژگاری معاویە دەکات پێی دەڵێت خۆت بپارێزە لە تورەیی، تورەیی باوەر خراپ دەکات.** "يا معاوية إياك والغضب، فإن الغضب يفسد الإيمان كما يفسد الصبر العسل" ( الطبرانى و البيهقي)

١٢- پێغەمبەری خودا باش دڵنیایە لەوەی مرۆڤ لەکاتی تورەیدا ناتوانێت بریاری دروست و دادپەروەرنە بدات بۆیە فرمانمان پێدەکات لەکاتی تورەییدا دادگەری نێوان دووکەس نەکەین.

"لا يحكم أحد بين اثنين وهو غضبان". رواه البخاري (٦٧٣٩) ومسلم (١٧١٧)

ئەم رێنماییانە لەگەڵ زانستی ئەمرۆدا نەك هاوتان و هاوتەریبن بەڵکو لەهەندێك روەوە لەپێش زانستەوەیە.



## خەمۆكی و ڕێنماییە ئایینیەكان بۆ چارەسەركردن

لەبەشێكی پێشتردا باسمان لە حاڵەتی پەشێوی مەزاجی دوو جەمسەری كرد كە یەكێك لە جەمسەرەكانی خەمۆكییە و جەمسەرەكەی تری شادیبوونە، لێرەدا تەنها نیشانەكانی و دەستنیشانكردنی خەمۆكی دادەنێینەوە بەبێ دەستكاری بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز جارێكی تر پێویست نەكات بۆ زانیارییەكە بگەڕێتەوە بەشی پێشوو.

### نیشانەكانی پەشێوی مەزاج:

**خەمۆكی:**

١- تاك لەزۆربەی كاتدا مەزاجی نییە یان مەزاجی كەمە ئارەزووی چالاكی نییە یان زۆر بەكەمی بەشداری چالاكی دەكات.

٢- ئارەزووی خواردنی كەم دەبێتەوە یان ئارەزووی نامێنێت، كێشی دادەبەزێت و هەندێكجار بەپێچەوانەوە ئارەزووی خواردنی زۆردەبێت و كێشی زیاددەكات.

٣- خشتەی خەوتنی تێك دەچێت و زۆرجار خەوی كەم دەبێتەوەو خەوی لێناكەوێت ئەگەر بخەوێت خێرا خێرا خەبەری دەبێتەوە و یان خەوی ناخۆش دەبینێت و دەشێت پاش نوستنی تەواویش وا هەست بكات كەنەنوستووە. بەپێچەوانەشەوە لەهەندێكی تردا ماوەی خەوتنی زیاتر دەبێت و سەرەڕای نوستن بۆ ماوەی پێویست هەست بەشەكەتی و ئارەزووی زیاتر دەكات بۆ خەو.

٤- لـەڕووی جەسـتەییەوە زۆربــەی کـات مــات و کــەم چـالاکە و هەندێکجار جوڵەی زۆر دەبێت و لەشوێنێکدا ئۆقرە ناگرێت.

٥- لـەڕووی سێکسـەوە کـەم بوونــەوەی ئـارەزووی کـاری سێکسـی لەهــەردوو ڕەگــەزدا یــان نــەمانی ئــارەزووی سێکســی، لەمێینــەدا تێکچونی سوڕی مانگانە.

٦- نەمانی وورە بۆ کار کردن و زوو هەست بەماندوویـەتی کـردن و خێرا شەکەت بوون.

٧- لۆمــە کردنــی خــود بەشــێوەیەکی نەشــیاو و هەســت کــردن بەگوناه وگەورە کردنی هەڵەکانی خۆی.

٨- کـــەم بونـــەوەی توانـــای بیرکردنـــەوە و ووریـــایی و لاوازی هۆشپێدان.

٩- زۆرکـات یـان هەمیشـە لایـەنی ڕەشـی یـان(سـلبی - نەگـەتیفی) ڕووداوەکــان دەبینێــت، نــەمانی ئۆمێــد و هیــوا بەئاینــدە و نــا ئومێـدبوون لەچـاکبونەوە و لـەو بـاوەڕەدا دەبێـت هـیچ چارەسـەرێك چاکی ناکاتەوە.

١٠- هـەروەها کەسـەکە ئـارەزووی مـردن دەکـات و دەشـێت بـیری خۆکوشتنی بەخەیاڵدا بێت و هەوڵی خۆکوشتن بدات.

## ئیسلام چۆن چارەسەری خەمۆکی دەکات:

١-یەکێك لە نیشانەکانی خەمۆکی ئەوەیە تاك هەست بەبێ ئومێدی دەکات چ بەرانبەر نەخۆشییەکەی چ بەرامبەر ئایندە بۆیە قورئان پێمان دەفەرمویێت کە هیچ کات نائومێد نەبین.

﴿یا بنيَ اذهبوا فتحسسُوا من يُوسُفَ وأخيهِ ولا تيأسُوا من رَوْحِ الله إنهُ لا ييأسُ من رَوْحِ الله إلا القومُ الكافِرُونَ﴾.(٨٧).

ئەی کورەکانم برۆن جا بکەرێن و هەواڵی یوسف و براکەی بزانن، نائۆمێدیش مەبن لە بەزەیی و میهرەبانی خوا، بەراستی نائومێد نابێت لە سۆز و میهرەبانی خوا جگە لەوانەی کەبێ بروان.

٢-بێگومان هۆکاری خەمۆکی زۆرە هەندێکی ناوەکین و هەندێکی هۆکاری دەرەکیە بۆیە لە ئایینی پیرۆزەی ئیسلامدا هانمان دەدات کە ئارامگربین بەرانبەر ناخۆشییەکان ﴿فصبرٌ جميلٌ واللهُ المستعانُ على ما تصفُون﴾ (یوسف ١٨). لەو کاتەی حەزرەتی یەعقوب پۆشاکی یوسفی کوری بۆ دێنن کە گوایە گورگ خواردویەتی لەو ساتە نارەحەت و بێزارییەدا دەڵێت ئارامگرتن باشە و خوا پشتو پەنایە، جا بەڵاو ناخۆشی ژیان هەرچیك بێت دەبێت مرۆڤی بروادار ئارامگربێت و سوپاس گوزاری خوا بکات.

٣-بەرزکردنەوەی سکاڵاو بێزاری تەنها بۆ لای خوا؛ بۆیە کاتێك یەعقوب هەست بە دڵتەنگی دەکات دەڵێت سکاڵای دڵتەنگی و بێتاقەتیەکەم لای خوا دەکەم، من لە لایەن خوا شتانێك دەزانك کە

ئێوە نایزانن ﴿إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ (یوسف ٨٦)، سەرجەم پێغەمبەران کاتی نارەحەتی و بێزاری زیاتر لەخوای بەخشندە پاراونەتەوە بۆ ئەوەی کار ئاسایان بۆ بکات وقورسیەکەیان لەسەر لابەرێت.

٤- روانینە ئەو راستییەی کە کاتێك توشی ناخۆشی و نارەحەتی و ئازار دەبیت، خوای بەخشندە گوناهێك کەمدەکاتەوە "مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلَا وَصَبٍ وَلَا هَمٍّ وَلَا حُزْنٍ وَلَا أَذًى وَلَا غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ " (رواه البخاري).

٥- تێگەشتن لەوەی دونیا کاتیە و شوێنی راستەقینەی موسمان قیامەتە: کاتێك روانیتە ژیان وەك رێبوارێك و خۆشیەکانی ژیانت تەنها لەبەر رەزامەندی خوای بەخشندە دەویست ئەو کات بۆ زۆربەی شتەکانی ژیان دڵتەنگ و خەمۆك نابێت. پێغەمبەریش دەفەرموێت ( دونیا بەندیخانەی بروادار و بەهەشتی بێباوەرە) "الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الْكَافِرِ "(رواه مسلم).

٦-نوێژکردن: کە یەکێکە لە پایە پتەوەکانی ئیسلام و تاکی بروادار هەمیشە بەنوێژکردن و سوجدەبردن هێوردەبێتەوە و هەست بە ئارامی دەکات و فێری خۆراگری دەبێت و کۆی پرۆسەی نوێژکردن جگەلەوەی پەرستشێکی مەزنە ئارامکەرەوەی جەستەو دەرونە. بە تایبەتی ئەگەر نوێژەکان بەشێوەیەکی دروست و لەسەرخۆ و ملکەچیوە بکەین. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ ( البقرة ١٥٣). ئەی ئەوانەی باوەرتان

هێناوه پشت ببەستن به ئارامگرتن و نوێژکردن بەراستی خوا لەگەڵ ئارامگرانه.

٧ سوجدەبردن: چونکه نزیکترین کات که بەنده له خواوه نزیک بێت کاتی سوجدەبردنه بۆیه گرنگه کاتی خەمۆکی و دڵتەنگی مرۆڤ زۆر سوجده بەرێت. ﴿أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد، فاجتهدوا في الدعاء﴾.(مسلم).

﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ (٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ (٩٨﴾ وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ (٩٩﴾ (الحجر).

لەم چەند ئایەتەی سورەتی (الحجر) باس له سێ ڕێگا دەکرێت بۆ زاڵبوون بەسەر دڵتەنگیدا

یەکەم: زیکردنی خوا.

دووەم: سوجدەبردن.

سێیەم: خواپەرستی

٨-هاوکاری یارمەتی دانی کەسانی تر:

سەرجەم سەرچاوه زانستیه دەروونیەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کاتێك تاك یارمەتی کەسێك دەدات یان کارێکی سوودبەخش دەکات بۆ بونەوەرێك هەست بە خۆشی و شادمانی دەکات، هەر لەوەی قسەیەکی باش بێت، بۆ هاوکاری دارایی، بۆ سەردان کردنی نەخۆش، بۆ چارەسەرکردنی گرفتی نێوان دوو کەس، بۆ یارمەتی ئاژەڵێك، بۆ تێرکردنی برسیەك بۆ.... هتد. بۆیه پێغەمبەری مەزن دەفەرموێت

خۆشەویســـــترینی کەســـــەکان لای خـــوا بەســـــودترینیانە، وە خۆشەویسترینی کارەکان لای خوای بالآدەست خۆشیەکە بیخەیتە دڵی موسمانەوە، بەوەی گرفتێکی لەسەر لابەریت، قەرزێکی بۆ بدەیتـەوە، برسێتی لەسەر کەمکەیتەوە، بەوەی لەگەڵ برایـەکی موسمانم بـڕۆم بـۆ جێبـەجێکردنی پێویستیەکی بەڵامـەوە خۆشـترە لـەوەی مانگێـك لەمزگەوت بمێنمەوە مەبەستی مزگەوتی پێغەمبەرە.

" أحـب النـاس إلى الله أنفعهـم، وأحـب الأعمـال إلى الله تعـالى سـرور تدخله على مسلم، تكشـف عنـه كربـة، أو تقضـي عنـه دينـا، أو تطـرد عنـه جوعـا، ولأن أمشـي مـع أخـي المسلم في حاجـة أحـب إلـيّ مـن أن أعتكف في هذا المسجد شهرا". (السلسلة الصحيحة: ج٢، (٩٠٦)

چونکە مرۆڤ بەم کردارانەی خۆی لە گۆشـەگیری رزگـار دەکـات و هەست بەبوونی خۆی دەکات وەك کەسێکی کاریگەر و سـوودبەخش و زیـاتر خـەریکی خـەڵکی دەبێـت وەك لـەوەی خـەریکی خـۆی بێـت، هەروەها بەهۆی ئەو کردارانـەوە خۆشەویستی کەسانی تـر بەدەسـت دێنێت، ئەمە جگە لەوەی دوعـاو پارانـەوەی کەسانی تـر بـۆی رەنگـە ببێتە هۆی شیفای لە نەخۆشییەکەی.

٩- هەنـدێك لـەو دوعایانـەی کـە پێغەمبـەران کردویانـە لـەکاتی دڵتەنگی:

• دوعای یونس پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ " پەروەردگارا هـیچ خوایـەك نیە جگە لەتۆ من لە ستەمکاران بووم" ﴿لا إله إلا أنـت سـبحانك إنـي كنت من الظالمين﴾

• كاتێك پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ بینی ئەبو ئومامە لە مزگەوتدایە کاتی نوێژ نیە پێی ووت چی دەکەی لەمزگەوت؟ ووتی: خەمباری و قەرز بێزاری کردووم، پێغەمبەر فێری ئەو دوعایەی کرد " قل إذا أصبحت وإذا أمسيت: اللهم إني أعوذ بك من الهم والحزن، وأعوذ بك من العجز والكسل، وأعوذ بك من الجبن والبخل، وأعوذ بك من غلبة الدين وقهر الرجال". ( سنن أبي داود).

ئیمامی بوخاریش بەشێوەیەکی تر دەیگێڕێتەوە " اللهُمَّ إنّي أعوذُ بكَ من الهمِّ والحزنِ والعجزِ والكسلِ والبُخلِ والجُبنِ وضلعِ الدَّينِ وغلبةِ الرِّجالِ" (رواه البخاري). پەروەردگارا من پەنا دەگرم بە تۆ لە دڵتەنگی و خەفەت و پەککەوتەیی و تەمەلی......

١٠- سەلاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ و زیکرەکان بەشێوەیەکی دروست و لەسەرخۆ بۆ هێورکردنەوەی دڵەکان لەلایەك و پاداشتی بێوێنە لەلایەکی ترەوە.

﴿الذين آمنوا وتطمئنُ قلوبهم بذكرِ اللهِ ألا بذكرِ اللهِ تطمئنُ القلوبُ﴾ (الرعد ٢٨) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و دڵەکانیان ئارام دەبێت بە زیکری خوا، جگە لەزیکری خوا دڵەکان بەجی ئارام دەبێتەوە.

١١-پشت بەستن بەخوای بەخشندە و بایەخدان بە کارەکانی ئەمڕۆ جێ هێشتنی سبەی بۆ خوای زانا و بالادەست.

١٢- بیرکردنەوە و ڕوانینە نیعمەکانی خوای گەورە و ڕوانیە ئەوانەی کە لەتۆ خراپترین یان لەخوارترن نەك ڕوانینە سەروخۆت

"انظرُوا إلى منْ هوَ أسفلَ منكمْ، ولا تنظرُوا إلى منْ هو فوقكمْ، فإنَّهُ أجدرُ ألا تزدرُوا نعمةَ اللهِ عليكمْ " (رواه الترمذي).

١٣- هەمیشە بیرمان بێت پاش ناخۆشی خۆشیدێت خوای بەخشندە ئەم راستیەمان لە قورئاندا پێ دەڵێت کە پاش نارەحەتی و ناخۆشی خۆشی دێت ﴿فإن مع العسر يسراً، إن مع العسر يسراً﴾ (الشرح ٥-٦).

لە قەرئاندا باس لە دلتەنگی و خەموکی پێغەمبەران و برواداران دەکات:

- ﴿فناداها منْ تحتها ألَّا تحزني قدْ جعلَ ربُّك تحتكِ سريًّا﴾ (مريم: ٢٤).

جبرەئیل یان عیسى بانگی مریەمی کرد لەژێر دار خورماکەوە ووتی: خەفەت مەخۆ پەروەردگارت لە خوارتەوە جۆگەیەك ئاوی بۆ فەراهەم کردووی.

- ﴿ولا تخافي ولا تحزني إنَّا رادُّوهُ إليكِ وجاعلوهُ منَ المُرسلينَ﴾ (القصص: ٧)

کاتێك دایکی موسى (علیە السلام) بێتاقەتی منداڵەکەی دەبێت، خەمبار مەبە و مەترسە ئێمە دەیگێرینەوە بۆت و دەیکەنە یەکێك لە پێغەمبەران.

- ﴿ولا تهنوا ولا تحزنوا وأنتمُ الأعلونَ إنْ كُنتمْ مُؤمنينَ﴾ (آل عمران: ١٣٩)

سست و دڵ لاواز و خەمبار مەبن هەر ئێوە بەرز و بلندن.

• ﴿إنَّ الذين قالوا ربُّنا اللهُ ثمَّ استقاموا تتنزّلُ عليهمُ الملائكةُ ألّا تخافوا ولا تحزنوا وأبشروا بالجنّةِ التي كنتم توعدونَ﴾ (فصلت: ٣٠).

ئەوانەی کە ووتیان خوا پەروەردگارمانە و لەپاشان راست بەردەوام بوون، فریشتەکان پۆل پۆل دێنە لایان (پێیان دەلێن) مەترسن و خەفەت مەخۆن، مژدە بێ لێتان ئەو بەهەشتەی کە بەلێنتان پێدرابوو.

• ﴿ولمّا أن جاءتْ رُسُلنا لوطا سِيءَ بهِمْ وضاقَ بهِمْ ذرْعا وقالوا لا تخفْ ولا تحزنْ إنّا مُنجّوكَ وأهلَكَ إلّا امرأتكَ كانتْ منَ الغابرينَ﴾ (العنكبوت: ٣٣).

کاتێك نێردراوەکانمان هاتن بۆ لای (لوط)، پێیان تێکچوو و نارەحەت بوو، ووتیان مەترسە و خەم مەخۆ، ئێمە تۆ خێزانەکەت رزگار دەکەین جگە لە ژنەکەت، کە ئەو لە جێماوان و تیاچووان دەبێت.

## وەسواسی

بریتیـە لەسـەرهەڵدانی حاڵـەتێکی دەرونـی کەهـەمان بـیر، بـۆ چوون، وێنە چەند بارە دەبێتـەوە لەمێشکی تاکدا و دڵنیایـە لـەوەی لەناخی خۆیدا سەرهەڵدەدات نەك لەدەرەوە بەسەریدا بسەپێنرێت و هــەوڵی بەرەنگاربونــەوەی دەدات بــەڵام زۆرجــار بێهودەیــە و ناچاردەبێت شوێنی ئەو بیرو بۆچونانە بکەوێت و کاتێکی زۆر بـەو بابەتانـەوە دەکوژێـت. ئەگـەر شـوێن ئـەو بیرانـە نەکـەوێت هەسـت بەنارەحەتی دەکات و وازی لێناهێنن دووبارەو چەندبارە دەبێتـەوە و ئەگەر شوێن ئەو بیرانە بکەوێت بۆ ماوەیەکی کاتی هەست بـەئارامی دەکات بەڵام کاتێکی زۆری لێـدەگرێت و بـەردەوام بابـەتی بێمانـاتر و سەیرتر بەمێشکیدا دێت.

بۆ نمونـە، تـاك بـەردەوام بەبیریـدا دێـت کەقسـەی ناشـرین یـان رەفتـارێکی نەشـیاو یـان کـوفر بکـات بـەبێ هـیچ هۆیـەکی دیـار، یـان بەبیریدا دێت لەوانەیە بەهۆی ئەمەوە زیـان بەدەوروبـەر بگەیـەنێت یا دووبارەکردنەوەی ژماردنی ژمارەکان بەشێوەیەکی دیاری کـراو یـان بەسەرا چوونەوەی کارەکانی رۆژانە زیـاد لـەجارێك بـۆ نموونـە دڵنیـا بوونـەوە چـەندین چـار لەداخسـتنی دەرگایـەك کـە سـوور ئـەزانێت داخراوە , هتد...........

هەنــدێکجار ئــەم بــارە لەســنوری بیرکردنــەوە تێپــەردەبێت و دەچـێتە بـواری کـردارەوە وەکـو دووبـارە وچـەندبارە دەسـت شـتن هەندێکجار تاك ماوەی چەند کاژێرێـك بـەم کـارەوە خـەریك دەبێـت،

سەرەڕای ئەوەی دەزانێت دەستی پاکە یان ئەم کارەی زیادەڕۆیی تێدایە. چەند بارەکردنەوەی قامەت بەستن لەنوێژدا، شەوان چەند جارێك دەست دەدات لەدەرگای ژوورەکە بۆ دڵنیابوون لەداخستنی سەرەڕای ئەوەی دەزانێت کەدەرگاکە داخراوە.

ڕێکخستنی کەل وپەلەکانی بەشێوەیەکی زۆر وورد و بەدیقەت کەتەنها لای تاکی واسواس مانای هەیە و لای کەسانی دەوروبەری بەنائاسایی ناو دەبرێت.

پرسیارکردنی بەردەوام (ئەی ئەگەر؟) واتە تاك بەردەوام پرسیاری ئەوە دەکات لە مێشکیدا ئەگەر وا نەبوو؟ ئەی ئەگەر وابوو؟ مەبەست لەمە ئەوەیە تاك شتەکان پێکەوە دەبەستێت بەبێ ئەوەی بنەمایەکی زانستی یان لۆژیکی بۆ ئەگەرەکانی هەبێت بۆ نمونە (ئەگەر دەست بدات لە دەرگایەکەوە لە مێشکیدا بیری بۆ دێت تۆ بڵێیت ئەو دەرگایە پیس نەبوبێت؟ تۆ بڵێیت من لەوەوە توشی نەخۆشی نەبم؟ من دواتر تەوقەم لەگەڵ کەسێکدا کرد تۆ بڵێیت ئەویش نەخۆش نەکەوتبێت؟ ئایا لەو کەسەوە چەندی تر توشی هەمان نەخۆشی بوون؟ بەدوای ئەم ئەگەرانەوە دەبێت دەیەها پرسیاری نالۆژیکی بە خەیالیدا دێت؟

ئەگەر گومانی لە کردنی کارێك هەبێت بۆ نمونە کوژاندنەوەی پلاك ئەوە بیرەکانی بەو ئاراستەیە دەڕۆن تۆ بڵێیت شۆرتی کارەبا ڕونەدات؟ ئەبێت لەو شۆرتەوە جی بسوتێت؟ تەنها ئامێرێك یان هەموو ماڵەکە؟ چەند کەس بەو سوتانە دەسوتێن و دەمرن؟ تەنها

ماڵێ خۆمان یان هەموو گەڕەك؟ ئەی ئەوانەی ئاگرەکە دەکوژێنەوە چەندیان زیانیان بەردەکەوێت؟ دواتر من چیم بەسەردێت؟ دەیەها پرسیار و ئەگەری نادروست و نالۆژیکی.

هەڵگرتن و کۆکردنەوەی شتی زیادە و بێسود لەترسی ئەوەی نەك پێویستی پێیان بێت یان ڕەنگە نەتوانێت بڕیار بدات کامیان فرەێ بدات.

هەندێکجار پەیوەندی نێوان ئەو بیرانەو ئەو ڕەفتارەی دەیکات بەروونی دیارە وەکو ئەوەی گومانی ئەوەی هەیە شتەکان پیسن بۆیە بەردەوام دەستی دەشوات یان دەست نادات لەشتەکانەوە تاکو پیس نەبێت، یان گومانی لەباوەڕی خۆی هەیە بۆیە چەندەها جار شایەتمان دووبارە دەکاتەوە و قورئان دەخوێنێت و بەردەوام نوێژ دەکات تاکو ئیمانی سەلامەت بێت، لەهەندێك حاڵەتی تردا ئەم پەیوەندیە روون نیە وەکو ئەوەی تاك هەڵدەستێت بەپۆشینی پۆشاکەکانی بەشێوەیەکی دیاری کراو و دەبێت چەند ڕەفتارێك بکات پێش لەبەرکردنی پۆشاکەکەی کەهیچ پەیوەندیەك نیە لەنێوان ئەو ڕەفتارانە و خۆگۆڕین.

ئەم حاڵەتە نزیکەی لە (٠.٥ ٪ - ٢٪) ی خەڵکی توشی دەبن و ڕێژەی توشبونی نێرو مێ تاڕادەیەك یەکسانە. لە (٧٠٪) ی حاڵەتەکان پێش تەمەنی (٢٥) ساڵی ڕوودەدەن و لە (١٥٪) یان دوای تەمەنی (٣٥) ساڵی.

دەستنیشانکردن:

بەپێ مانوەڵی دەسنیشانکردن و ئامارکردنی نەخۆشیە دەرونیەکان چاپی پێنجەم دەبێت تاك ئەم تایبەتایبەتمەندیانەی هەبێت بۆ ئەوەی بڵێن وەسواسی هەیە:

١- بوونی وەسواس یان ڕەفتاری سەپێنراو یان هەردووکیان.

بیر یان پاڵنەر یان وێنەی چەندبارە و جێگیر، کەنەخوازراوو هێرشبەرە، لای زۆربەی تاکەکان دڵەراوکێ و بیزاری ئاشکرا دروست دەکات.

نەخۆش هەوڵدەدات پشتگوێی بخات یان زاڵبێت بەسەریدا یان بیگۆرێت بۆ بیر و ڕەفتاری تر (یان ڕەفتاری سەپێنراو بکات)

ڕەفتاری سەپێنراو دەبێت ئەم دوو تایبەتمەندییەی هەبێت:

• ڕەفتاری چەندبارە (شۆردنی دەستەکان، ڕێکخستن، دڵنیابونەوە) یان ڕەفتاری هزری (نوێژکردن، ژماردن، چەندبارەکردنەوەی ووشە بە بێدەنگی) کەتاك هەست دەکات دەبێت بیکات وەك وەلامدانەوەیەك بۆ وەسواسیەکەی.

• ئامانجی ئەم ڕەفتارو کردارە هزریانە بۆ ڕێگرتن یان کەمکردنەوەی دڵەراوکێی و نائومێدیە، یان ڕێگرتنە لە ڕووداوێکی یان کارەساتێکی ناخۆش، ئەم ڕەفتارو کردارە هزریانە ڕاڤەیەکی دروستی نیە بۆ ڕێگرتن یان زیادەرۆیی تێدایە.

٢-ئەم وەسواس و ڕەفتارە سەپێنراوانە کات دەگرێت (لایەنی کەم ڕۆژانە ماوەی یەك کاژێر) یان دەبێتە هۆی نائومێدی و لاوازی توانای کۆمەڵایەتی و پیشەیی یان بوارە گرنگەکانی تری ژیان.

I. هۆکاری ئەم نیشانانە بەهۆی بەکارهێنانی دەرمان یان مژاد یان نەخۆشی ترەوە نیە.

II. ئەم نیشانانە باشتر ڕاڤە ناکرێت بە نەخۆشییەکی دەرونی تر (دڵەڕاوکێی توند، بایەخدان بە روخسار، پەشێوی ناتەواوی شێوەی جەستە،....

## هۆکاری ئەم حاڵەتە:

١- بۆماوە: بەڵام نەك بەو مانایەی ئەگەر باوان ئەم حاڵەتەیان هەبوو منداڵەکانیان توش دەبن بەڵکو لەو تێروانینەوە کەئەگەری توشبوون زیاد دەکات بۆ (٣٪-٧٪).

دوانەی یەك هێلکە (٥٠٪ - ٨٠٪) و دووانەی دوو هێلکە لە (٢٥٪).

٢-پەروەردەکردن: پەروەدەکردنی منداڵ لەسەرشێوازێکی تایبەت بەتایبەتی لەلایەن دایکی واسواسەوە وادەکات ئەگەری توشبوون زیاتر بێت.

٣-ئاستی سیرۆتۆنین: دابەزینی ئاستی سیرۆتۆنین لەمێشکدا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەم حاڵەتە بۆیە لەچارەسەردا پشت بەو دەرمانانە دەبەسترێت کەئاستی ئەم مادەیە لەمێشکدا زیاد دەکەن.

زۆر گرنگە بۆ پزیشك کەئەم حاڵەتە لەتەنگژەی دڵەراوکێی گشتی و خەمۆکی و سکیتزۆفرینیا جیابکاتەوە سەرەڕای دڵنیابوون لەنەبوونی نەخۆشی جەستەیی.

چارەسەر:

١- هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی هەر نەخۆشییەك کەهاوشان بێت لەگەڵیدا وەکو خەمۆکی.

٢-روونکردنەوەی هۆکار و نیشانەکانی نەخۆشییەکە بۆ تاك وخێزانەکەی کەئەم حاڵەتە جێی ترس نیە و چارەسەر دەبێت.

٣-بەکارهێنانی دەرمانی دژە دڵەراوکێ بۆ ماوەیەکی کورت ئەگەر پێویستی کرد. لەژێر فشاری نەخۆش یان کەسوکاری نەخۆش بۆ ماوەی زیاتر لەپێویست بەکار نەهێنرێت چونکە دەبێتە هۆی ئالودەبوون.

٤- پەیڕەوی کردنی ڕاهێنانەکانی خۆ خاوکردنەوە و تێفروسماندن (ایحاء) بەخود تاکو زاڵبیت بەسەر ئەو بیرانەدا.

٥- پەیڕەوی کردنی ڕێنماییەکانی چارەسازی دەروونی و پزیشکی دەروونی کەدەدرێت بەتاك لەکاتی دانیشتنەکانی چارەسەری دەروونیدا. بۆ نمونە ئەگەر نەخۆش زۆر دەستی دەشوات یان کەکارێك دەکات دەبێت چەند جارێك دووبارەی بکاتەوە تا دڵنیابێت دەتوانرێت لەڕێگەی خشتەیەکەوە ژمارەی جارەکان وورده وورده کەم بکرێتەوە بۆ نمونە ئەگەر (١٠) جار بێت هەوڵدەدرێت هەر هەفتەی جارێك

کەمبکرێتەوە یان ئەگەر بۆ ماوەی چەند کاژێرێك خۆی دەشوات دەتوانێت هەر هەفتەی (١٥) خولەك لەماوەی خۆشتنەکەی کەم بکاتەوە تا دەگاتە ئاستی ئاسایی یان نزیکەو ئاسایی. ئەگەر گومانی لەشتەکان هەبوو کەپیسن یان نەی دەتوانی دەستکاری شتەکان بکات لەو بۆچونەی کەپیسن ئەوە ریزبەندی شتەکان دەکرێت و داوا لەکەسەکە دەکرێت بەپێی توندیان ریزبەندیان بکات و هێدی هێدی هەوڵ دەدرێت زاڵبوون بەسەر حاڵەتەکاندا روبدات و واباشە چارەسازی دەرونی خۆی ئامادەبێت لەکاتی ڕاهێنانەکاندا.

٦- بەکارهێنانی دەرمانەکان بەبری پێویست و بۆ ماوەی دیاریکراو کەلەلایەن پزیشکەوە دیاری دەکرێت بەکاربهێنرێت، لەزۆربەی حاڵەتەکاندا (١٦ – ٢٤) هەفتەیە ئەگەر پێویستی کرد بۆ ماوەیەکی درێژتریش بەکاردەهێنرێت چونکە نابێتە هۆی ئالوودەبوون.

٧- گرنگترین دەرمان کەبەکاردەهێنرێت دەرمانەکانی دژەخەمۆکی بەتایبەتی ئەو گروپەیان کەتایبەتمەندە بەکەمکردنەوەی گەڕاندنەوەی مادەی سیرۆتۆنین بۆ دەمارەخانەکان بەمەش ئاستی سیرۆتۆنین بەرزدەبێتەوە. نمونەی ئەم گروپەش وەك فلوکستین و سێرترالین و پارۆکستین و سیتالۆپرام و ئیسیتالۆپرام..... هتد.

ئایندەی تاك:

دوو لەسێی حاڵەتەکان لەماوەی کەمتر لەساڵێدا چاك دەبنەوە بەبەکارهێنانی دەرمانی پێویست و ئەوانی تر (یەك لەسێ)

**حاڵەتـــەکایان چـــاك دەبێـــت بـــەڵام ناوبـــەناو نیشـــانەکانیان سەرهەڵدەداتەوە و پێویستیان بـەرێنمایی و چارەسـەری درێژخایـەن دەبێت.**

**لە (٢٠ ٪-٣٠٪) بەتەواوی چاك دەبنەوە.**

**لە (٤٠٪-٥٠٪) چاکبونەوەیەکی مامناوەند.**

**لە (٢٠٪-٤٠٪) دەبێتە حاڵەتێکی درێژخایەن.**

ئەو هۆکارانەی ئایندەی تاك خراپ دەکەن:

١- بوونی وەسواسی کرداری.

٢- لەمنداڵیەوە یان لەسەرەتایی هەرزەکاریەوە دەست پێبکات.

٣- ماوەیەکی زۆر بخایەنێت.

٤- هاوشان بێت لەگەڵ خەمۆکی.

٥- وەسواسیە کرداریەکەی بـازاڕی بێـت واتـە پەیوەنـدی نـەبێت بەجۆری وەسواسیە فکریەکەوە.

٦- بونی وەهم.

٧- پەشێوی کەسێتی وەکو کەسێتی وەسواسی یان سکیزۆتایپەڵ.

پەیامەکان بۆ تاك و خێزان:

**١- بـەهیچ جۆرێـك پێویسـت ناکـات بـۆ چارەسـەری ئـەم حاڵەتـە سـەردانی کەسـانی ناشـارەزا بکرێـت کـەناوی خۆیـان نـاوە (مـەلا) و (شێخ) چونکە ئەمـە کـاری ئـەوان نیـە و زۆربـەی جار لـەبری چـاك کردنـــەوە حاڵەتەکـــە خـــراپتری دەکـــەن بـــەهۆی ئـــەو شـــێوازە نـــا**

مرۆڤانەیەی بەکاری دێنن لەچارەسەردا کەنە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و نەزانستی پزیشکی و نەیاسای وولات ڕێگەی بەم کارمیان نەداوە.

٢-ئەم حاڵەتە نەنگی نیەو نابێتە هۆی لەدەستدانی هۆشمەندی.

٣-زوربەی کات ئەم حاڵەتە چارەسەری هەیە و دەتوانرێت لەڕێگەی دەرمان و جەلسەی دەروونیەوە چارەسەر بکرێت.

٤- تاکو زووتر سەردانی پزیشك بکەیت ئەگەری چاکبونت زۆرتر و باشترە.

٥- گەر تاکێکی خێزانەکەت ئەم بارەی هەبوو دەبێت خۆت بەدوور بگری لەتوانج لێدان و قسەی ناشرین چونکە بەم کارەت بارەکە خراپتر دەکەیت نەك باشتر، بەم کارەت وا دەکەیت ئەو کەسە زیاتر نارەحەت بێت.

٦-هەوڵمەدە فشار بخەیتە سەر تاك بۆ زوو چاك بونەوە چونکە ئەوەی ئەو هەستی پێدەکات تۆ ناتوانیت بەئاسانی لێی تێبگەیت هەوڵبدە هاوڕێی بیت نەك فشارێکی زیاتر.

## هەندێك پرسیاری گرنگ

## كەلای نەخۆش و لای ئەندامانی خێزان دروست دەبێت:

١- ئایا هەموو ئەوانەی وەسواسیان هەیە دەبێت بەكردار شتەكان چەندبارە بكەنەوە؟

**بێگومان نەخێر، وەسواسی دوو جۆری سەرەكی هەیە جۆرێكیان تاك تەنها لەمێشكیدا شتەكان دووبارە دەكاتەوە تەنها بیر یان وێنەی بۆ دێت، لەجۆری دووەمدا تاك بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو بیرانەدا بەكردەوە كارەكە یان هەندێك كردار دەكات تاكو برێك ئارام بێتەوە بۆ ماوەیەك بیرەكان وازی لێبێنن.**

٢-ئایا هەر كەسێك یەكێك یان زیاتر لەو نیشانانەی هەبێت واتە ئەو نەخۆشییەی هەیە؟

**دەكەوێتە سەر بری كاریگەری ئەو نیشانانە لەسەر توانای كاركردن و پەیوەندی كۆمەڵایەتیت، هەتا نیشانەكە توند بێت ئەگەری بونی حاڵەتەكە زیاترە.**

٣-ئایا ئەم نەخۆشییە نەخۆشییەكی تازەیە؟

**بەڵگە مێژووییەكان ئەوە دەسەلمێنن كەمێژووی ئەم نەخۆشییە زۆر كۆنە.**

٤-ئایا نەخۆشی وەسواسی نەخۆشییەكی هۆشمەندییە واتە عەقلیە؟

**نەخێر حاڵەتێكی دەرونیە و تاك هەست بەخۆی دەكات كەنەخۆشە و بەشوێن چارەسەردا دەگەرێت و هۆكاری دەرونی و جەستەیی خۆی هەیە بۆ توشبون.**

٥-ئایا نەخۆشی تر هەیە کەهاوشان بێت لەگەڵ نەخۆشی وەسواسی؟

**بەڵێ ئەوانەی نەخۆشی وەسواسیان هەیە زیاتر توشی خەمۆکی (نزیکەی لە (٦٠٪) یان لایەنی کەم بۆ جارێك توشی خەمۆکی دەبن) و ترس و دڵەراوکێ و تەنانەت بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکانیش دەبن.**

٦-ئایا دەگوێزرێتەوە لەیەکێکەوە بۆیەکێی تر؟

**نەخێر ئەم نەخۆشییە و سەرجەم نەخۆشییە دەرونیەکانی تر ئەگەری گواستنەوەیان نیە، بەڵام ئەگەری فێربونیان هەیە بەتایبەتی کاتێك دایك ئەم حاڵەتەی هەبێت و زیاتر لەپێویست بایەخ بەپاکوخاوێنی بدات ئەگەری فێربوون و لاسایی کردنەوەی لەلایەن منداڵەکانیەوە زۆرترە.**

٧-هەندێکجار نەخۆش بەووشەی تەلاقەوە دەیگرێت و زۆر بیری لێدەکاتەوە ئایا بەوە تەلاقی دەکەوێت؟

**هەرچەندە بیربکەیتەوە لەتەلاق و لەبەرخۆتەوە بیلێیت هەرگیز بەوە تەلاق ناکەوێت لەروانگەی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرەوە ﴿د.خ﴾** " إن الله عز وجل تجاوز عن أمتي ما وسوست به وحدثت به أنفسها ما لم تعمل أو تتكلم به " (رواه البخاري ٦٦٦٤ و مسلم ١٢٧). **واتە خوای باڵا دەست لەگوناهی ئومەتەکەم خوشبووە ئەوەی وەسوەسە دەکات یان لەبەرخۆیەوە قسەی پێدەکات بەمەرجێك بەکردەوە نەیکات یان لەناوخەڵکی دا باسی نەکات.**

تەنانەت بەبۆچوونی هەندێك لەزانایان ئەگەر یەكێك نەخۆشی وەسواسی هەبێت و بەزارەكی واتە بە وشەش تەلاق بڵێت بەڵام مەبەستی نەبێت تەڵاق بدات دیسانەوە تەڵاقی ناكەوێت، لەروانگەی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەرەوە " لا طلاق ولا عتاق فی إغلاق" (رواه أبوداود ٢١٩٣ و ابن ماجة ٢٠٤٦). مانای (إغلاق) (بەپێی پێشەوا (ابن تیمیه) واتە داخرانی دڵ و مەبەست نەبوون یان نەزانینی ئەوەی دەیڵێیت، وەكو ئەوەی مەبەست و ئیرادەی نەبێت، ئەمەش تەلاقی بەزۆر و تێكچوون و كەسێك لەكاتی مەستی و توڕەیی زۆر و هەركەسێك مەبەستی ئەوە نەبێت یان نەزانێت چی دەڵێت دەگرێتەوە.

هەروەها لەسورەتی (الطلاق) دا ئایەتی (٧) دەفەرموێت ﴿ لا یكلف الله نفسا إلا ماآتاها﴾، (پەروەردگار لەسەر توانای تاكەوە فرمانی پێناكات) هەروەها لەسورەتی (التغابن) ئایەتی (١٦) دەفەرموێت ﴿فاتقوا الله ما استطعتم﴾. (خوا پەرستی بكەن چەندتان لە توانادایە)

٨-ئایا هەموو جۆرەكانی وەسواسی نەخۆشین یان پەیوەندیان بەشەیتانەوە هەیە؟

لەئایەتەكانی قورئاندا باس لەوەسوەسەی شەیتان و نەفس و انس و جن دەكرێت واتە سەرجەم وەسوەسەكان هەمان سەرچاوەیان نیە.

سەبارەت بەوەسوەسەی شەیتان لەسورەتی (طه) ئایەتی (١٢٠) خوای بەخشندە دەفەرموێت ﴿فوسوس إلیه الشیطان قال یادم هل

أدلك على شجرة الخلد وملك لا يبلى﴾. شەیتان نیازی خراپی خستە دڵیەوە ووتی ئەی ئادەم ئایا نیشانت بدەم درەختی نەمری و موڵك و دەستەڵاتێ هەر دوایی نەیەت.

سەبارەت بەوەسوەسەی نەفس لەسورەتی ( ق) ئایەتی ١٦ خوای بەخشندە دەفەرموێت ﴿ ولقد خلقنا الانسان ونعلم ما توسوس به نفسه ونحن أقرب اليه من حبل الوريد﴾. ئێمە ئادەمیمان بەدیهێناوە و چاك ئاگادارین بەو خەیاڵ و خەتەرانەی دێن بە دڵ و دەرونیدا وە ئێمە لەوەوە نزیکترین لە شادەماری دڵی.

سەبارەت بەوەسوەسەی جنۆکە و مرۆڤ لەسورەتی (الناس) دەفەرموێت ﴿من شر الوسواس الخناس. الذى يوسوس فى صدور الناس. من الجنة و الناس﴾. پەنادەگرم بەخوا لە زیانی وەسوەسە پەیداکەری خۆ پەنهانکەر ئەوەی وەسوەسە دەخاتە دڵی خەڵکی لە جنۆکە و ئادەمیزاد.

وەسوەسەی شەیتان بەبەناگرتن بەخوا (استعاذة) چاکدەبێت یان لایەنی کەم کەمدەبێتەوە هەمان بار بۆ وەسوەسەی نەفسیش ڕاستە بەڵام وەسوەسەی نەخۆشی گۆڕانکاری تیا نابێت.

هەندێك لەزانا ئایینیەکان باس لەجیاوازی وەسوەسەی نەفس و شەیتان دەکەن بەوەی ئەگەر نەفست پێی خۆش بێت ئەوە وەسوەسەی نەفسە و ئەگەر پێت ناخۆش بوو وەسوەسەی شەیتانە، لەوەسوەسەی شەیتاندا هەوڵدەدات خراپەت لا جوان بکات و ئەگەر ئەو خراپەیە نەکەی هەوڵدەدات خراپەیەکی تر پێبکات گرنگ

ئەندامانی خێزان هەوڵی بژێوی ژیانیان بدەن لەسەرچاوەی ترەوە کەدەشێت نادروست بێت.

تاك ئامادەیە لەو پێناوەدا درۆ یا دزی بکات تاکو بڕی پێویستی لەمەی دەست بکەوێت، شەوان درەنگ دێتەوە، دەبێتە میوانی بار و یانەکان و هاوەڵەکانی زۆربەی هاوشێوەی خۆیین و بایەخدانی بەکێشەکانی خێزان کەم دەبێتەوە و لەجیهانێکی تایبەت بەخۆی دەژی و پەیوەندی لەگەڵ ئەندامانی خێزان کەم دەبێتەوە و کەمترین ماوە لەگەڵ ئەواندا بەسەردەبات و زۆر جار بەربەستێك دروست دەبێت لەنێوان ئەو و ئەندامانی تری خێزاندا کەوادەکات متمانەی پێنەکەن وهاوبەشی نەکەن لەکێشەکانی خۆیان.

دەشێت بەهۆی ئەمەوە ئەندامانی تری خێزان فێری هەمان ڕەفتار ببن و ئەم خۆی هاندەریان بێت و بۆ ئەوەی کەش و هەوای تایبەتی هەبێت وداوای هەندێك شتی نەشیاویان لێبکات وەکو بینینی رۆڵی ئەو سۆزانیانەی کەبەناوی هونەرەوە سەمادەکەن و هونەری سەماکردنیش دەشێوێنن و ئەمیش رۆڵی پیاوە چوار پێکە دەبینێت کەبەدەوری سەماکەردا دەسوڕیتەوە ناوبەناو سەماکەر سواری دەبێت!!!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی لەڕووی سێکسیەوە لاواز دەبێت وناتوانێت بەشێوەی جاران بەهەمان چالاکی پەیوەندی لەگەڵ خێزانەکەیدا هەبێت و تووشی واهیمەی خیانەت دەبێت و ڕەنگە بگاتە ئاستی ئەوەی خێزانەکەی تەلاق بدات یان بیکوژێت و هەندێکجار منداڵەکانی و خۆیشی دەکوژێت.

ڕێــــژەی تەلاقــــدان لـــەنێوان مـــەی خۆرانــــدا زیـــاترە وەك لەخێزانەکانی تر، هەروەها خێزانی ئـەو پیاوانـەی دەخۆنـەوە زیـاتر ئەگــەری توشــبوونیان هەیــە بەدڵــەراوکێ و خــەمۆکی و دابرانـــی کۆمەڵایەتی.

پەیوەندی سێکسی نادروست لەگەڵ تـابۆدا واتـە لەگـەڵ کەسـانی پلەیـەك و ئەوانـەی ناشـێت کـاری سێکسیان لەگەڵ بکرێـت لـەنێوان مەی خۆراندا زۆر زیاترە وەك لەکەسانی تر و چیرۆکی دەست درێـژی کردنە سـەر خوشـك و دایـك وخێزانـی بـاوك لـەنێوان مـەی خۆرانـدا شتێکی نامۆ نییە.

٥- زیانی کۆمەڵایەتی:

a. ڕەفتــاری دژەکۆمــەڵ و دژە یاسـا. (درۆکــردن، دزیکــردن، توندوتیژی لەنێوخێزان و لەکۆمەڵگەدا، ناپـاکی) لـەتاکی بەکاربـەر و ئالودەبواندا زۆر زیاترە لەتاکی ئاسایی.

b. لەناوبردنی بنەماکانی خێزان و دابرانـی پەیوەنـدی نێـوان ئەندامەکان و ئاژاوەو شـەری بـەردەوام و نـەبونی ئـارامی و بێئاگـایی لەئـەرکی خـۆی بەرامبـەر تاکـەکانی خێـزان و نـەمانی ڕۆڵ و پێگـەی لەخێزاندا.

c. نـــەتوانینی خۆگونجانـــدن لەگـــەڵ ئەنـــدامانی خێـــزان وکۆمەڵگە.

d. سـوکایەتی کـردن بەبـەها کۆمەڵایەتیـەکان و هەوڵـدان بـۆ هێنانـەوەی پاسـاوی نابـەجێ بـۆ ڕەفتـارە نەشـیاوەکانی. هەنـدێکجار

**خۆی گەلێك پەستە بەم ڕەفتارانەی و هەوڵ دەدات واز لەئالودەبوون بێنێت بەڵام ناتوانێت بۆیە هەستی خۆبەکەم زانین و خەمۆکی و دڵەراوکی.... لەنێوانیاندا زۆر زیاترە بەبەراورد بەتاکەکانی تری کۆمەڵ.**

**e. پەنابردنە بەر درۆ و دزیکردن بۆ بەدەستکەوتنی مۆادەکە.**

٦-زیانی ئابوری:

**a. بەهەدەردانی پارەیەکی زۆر بۆ بنیادنانی نەخۆشخانەو سەنتەری تایبەتی بۆ چارەسەری حاڵەتەکان و بنیادنانی بەندیخانە بۆ ئەوانەی بازرگانی پێوە دەکەن.**

**b. بەکارهێنانی توانایەکی زۆری مرۆیی بۆ ڕێگرتن و چارەسەرکردنی حاڵەتەکان لەوەزارەتی ناوخۆ و کاروباری کۆمەڵایەتی و تەندروستی و ڕێکخراوەکان.**

**c. بەفیڕۆدانی پارەیەکی زۆر بۆ کرینی ئەو مادانە و بەهەدەردانی سەروەتی نیشتمانی.**

**d. کەمبونەوەی توانای بەرهەم هێنانی تاکەکان چونکە برێکی زۆری ئەوانەی ئالوودە دەبن کەسانی لاون بەهۆی توشبونیان بەنەخۆشی یان کەمبونەوەی توانای کارکردنیان یان مانەوەیان لەودیو دیواری بەندیخانە.**

e. بەهۆی توشبونیان بەگەلێك نەخۆشی و ئەگەری بونی منداڵی نائاسایی برێکی زۆر لەداهاتی گشتی بۆ چارەسەری ئەم گرفتانە خەرج دەکرێت.

٧-زیانی نیشتمانی:

گومان لەوەدا نیە پتەوی هێزی هەر وولاتێك بەتواناو داهێنان و باری ئابوری و پێگەی سیاسی ئەو وولاتەوە بەندە، لەکاتێکدا هەزارەها گەنجی وولاتێك لەو دیو دیواری بەندیخانەکانەوە بن (بەهۆی بازرگانی کردن بەمادەی هۆشبەر) و هەزارەهای تریان لەسەر چرپای نەخۆشخانەکان کەوتبن(بۆ چارەسەر) و برێکی زۆر لەپارەی وولات بچێتە دەرەوە بۆ کرینی ئەو مادانە و کرینی چارەسەر بۆ نەخۆشەکان و هەزارانی تر خەریکبن بەپێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ نەخۆش و بەندکراوەکان و وولاتانی دراوسێ هەوڵبدەن یەکتر لاوازبکەن لەرێگەی بڵاوکردنەوەی ئەم مادانە لەلای بەرامبەر، دەگەینە ئەو راستەی ئەو وولاتانەی بەدەست کێشەی ئالودەبونەوە دەناڵن چەند گرفتایان هەیە پێگەی سیاسیان چەند لەرزۆکە.

**کاریگەری خواردنەوە بەپێ ئەو برەی تاك دەیخواتەوە دەگۆڕێت بەم جۆرەی خوارەوە:**

| | |
|---|---|
| کاریگەری کەم لەسەر باری کۆمەلایەتی و تەندروستی | **نێر بری کەمتر لە (٢٠) یەکە /هەفتە**<br>**مێ کەمتر لە (١٤) یەکە/هەفتە** |
| کاریگەری مامناوەندی لەسەر باری کۆمەلایەتی و تەندروستی | **نێر بری (٢١-٥٠) یەکە /هەفتەیەکدا**<br>**مێینە بری (١٥-٣٥) یەکە/ هەفتەیەکدا** |
| کاریگەری زۆر لەسەر باری کۆمەلایەتی و تەندروستی | **نێر بری زیاتر لە (٥٠) یەکە / هەفتە**<br>**مێ بری زیاتر لە (٣٥) یەکە/ هەفتە** |

مەبەستمان لەیەکە چییە؟

**نزیکەی (٨) گرام ئەلکحول یەکسانە بەیەك یەکە لەم خشتەیەی خوارەوەدا ڕێژەی سەدی ئەلکحول لەهەندێك جۆری مەشروبدا روون کراوەتەوە لەگەڵ ئەوەی هەریەکەیان چەند یەکەیان تێدایە:**

| جۆری مەشروب | ڕێژەی سەدی ئەلکحول | یەکە |
|---|---|---|
| **بیرە** | ٪٣ | **٢ یەکە /پاینت** |
| **بیرەی خەست** | ٪٥ .٥ | **٤ یەکە /پاینت** |
| **سیدار** | ٪٤ | **٣ یەکە /پاینت** |
| **واین** | ٪١٠-٨ | **٧ یەکە /بوتلێك** |
| **شێری، پۆرت، ڤێرمۆس** | ٪١٦-١٣ | **١٥ یەکە /بوتلێك** |
| **ویسکی، جن، ڤۆدگا، برانتی** | ٪٣٢ | **٣٠ یەکە/بوتلێك** |

ئەوانەی مەی خۆرن پێش کەسانی تر دەمرن بەهۆی:

**١- توندوتیژی لەتوێژینەوەیەکدا لەئەمەریکا ئاماژە بەوە دەدات (٢٤٪) مردن دەگەڕێتەوەوە بۆ توندوتیژی.**

**٢- خۆکوشتن لەمەی خۆراندا شەش هێندەی مەی نەخۆرانە.**

**٣- ڕووداوی ڕێوبان.**

**٤- هەوکردنی جگەر وپەنکریاس و سییەکان.....**

**٥- نەخۆشییەکانی کۆئەندامی سوڕان وەکو بەرزی فشاری خوێن وپەتکە(جەڵتە)ی دەماغ.**

**٦- بەدخۆراکی کەمی فیتامینەکان بەتایبەتی کۆمەڵەی فیتامین بی.**

**٧- پەرکەم کەلەئەنجامدا زۆرتر تووشی بەرکەوتن دەبێت.**

**٨- ژەهراوی بوون بەهۆی خواردنەوەی بڕێکی زۆر مەی.**

ئایندەی تاک:

**ئەوانەی لەسەرەتای دەست پێکردندان دەتوانن وازبهێنن و نەگەڕێنەوە سەرئەم کارە و ئایندەیان باشە، بەڵام ئەو تاکەی ئەم سیفەتانەی خوارەوەی هەبێت ئایندەی گەش نییە:**

**١- ئەوانەی تێکچوونی کەسێتیان هەیە بەتایبەتی کەسێتی دژە کۆمەڵ.**

**٢- ئەوانەی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە دابراون و بەتەنیا دەژین.**

**٣- ئەوانەی سزادراون یان بەندکروان بەتاوانی خواردنەوە.**

٤- ئەوانەی بێکارن.

٥- ئەوانـەی تووشـی نەخۆشـی هـاتوون بـەهۆی ئەلکحولـەوە وەکـو نەخۆشی جگەر و هەوکردنی پەنکریاس وسییەکان.

خۆپاراستن:

هەمیشـە دەڵـێین خۆپاراسـتن لەچارەسـەرکردن باشـترە، بۆیـە ئەگەرتاك هەر لەسەرەتاوە خـۆی بپارێزێـت زۆر باشـترو چاکترە وەك لـەوەی کەتووشـی ئـاڵوودەبوون بێـت، نیشـانەکانی (ماکـەکانی) بەکارهێنانی تیا دەربکەوێت پاشان بەشوێن چارەسەردا بگەڕێت.

لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەنێوان سالآنی (١٩٢٠-١٩٣٣) هـەوڵێکی جدیانـە درا بـۆ ڕێگـرتن لەمـەی خوادنـەوە و کۆمەڵـە یاسایەکی توند دانرا بۆ سەرپێچی کەران، ئەنجامەکەی:

١- ٢٠٠ کەس لەسێدارەدران.

٢- ٥٠٠.٠٠٠ (نیو ملیۆن) کەس بەندکران بەهۆی سەرپێچیەوە.

٣- هەڵمەتەکە سـەرنەکەوت و ڕێگەدرایـەوە بـەهاوڵاتیان بـۆ سـەر لەنوێ مەستی!.

ئەم ڕێگە پێدانە لەسەر بنەمای سوودو زیـان نـەبوو واتـە لەبـەر ئەوە نـەبوو کەمـەی سوودی هەیـە بـەڵکو لەبـەر ئـەوەی هەڵمەتەکە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا!.



ئـەتوانین گـرنگترین ڕێگـەکانی خۆپاراسـتن و بەرەنگاربوونـەوە ئاژمار بکەین بە:

١- کەم کردنەوەی بەرهەم هێنانی ئەلکحول.

٢- کەم کردنەوەی هێنانی مەی لەدەرەوەی وولآت و دانـانی بـاجی زۆر تاکو نرخی بەرز بێتەوە کڕینی لەتوانای زۆربەی کەسدا نەبێت.

٣- کەم کردنەوەی ڕێژەی ئەلکحول لەگیراوەکاندا.

٤- دانـانی چـاودێری تەندروسـتی لەکارگـەکانی بەرهـەم هێنـانی ئەلکحول تاکو بری ئەلکحول زیادنەکرێت لەگیراوەکاندا.

٥- دیاری کردنی شـوێنی فرۆشـتن و دانـانی کـاتی دیـاری کـراو بـۆ فرۆشـتن. کەبکەوێتـە شــەوەوە چـونکە لـەو کاتـەدا برێکـی زۆر لەهەرزەکاران ناتوانن ماڵ بەجێبهێڵن.

٦- بەرزکردنــەوەی تەمــەنی ئەوانــەی ســەردانی بـاڕ و یانــەکان دەکەن لە (١٨) ساڵیەوە بۆ (٢١) ساڵی.

٧- کـــەم کردنـــەوەی ریکـــلام لەکەناڵـــەکانی ڕاگەیاندنـــەوە (تەلـەفزیۆن، ڕۆژنامـەو گۆڤارەکـان...). پێچـەوانەی ئـەوە ناوبـەناو ڕاگەیاندنی هەڵمەتی وشیارکردنەوە لەسەر زیانەکانی.

٨- نوسـینی ئاگادارکردنـەوە لەسـەر سـەرجەم بوتلـەکان کەمـەی زیانبەخشە وەکو چۆن لەسەر پاکەتی جگەرە دەنوسرێت.

٩- کـەم کردنـەوەی لێـدانی ئـەو فلـیم و زنجیرانـەی کەپاڵـەوان کەسێکی مـەی خـۆرە و لەهـەمان کاتـدا تـاکێکی نمونەییـە و دڵسۆزی گەل و نیشتمان و بەها مرۆڤایەتییەکانە!؟.



١٠- دەرکردنی یاسای گونجاو بۆ ڕێگرتن لەمەی خواردنەوە یان دانانی ڕێوشوێنی پێویست بۆ کەمکردنەوەی بەکارهێنان.

١١- زیادکردنی ڕێنمایی و ڕۆشنبیری تەندروستی لەمەڕ زیانەکانی ئەلکحول لەخوێندنگە و زانکۆ و پەیمانگاکاندا.

١٢- بایەخ دانی دەرونی و کۆمەڵایەتی بەوخێزانانەی کەتاکێکیان مەی خۆرە بۆ ڕێگرتن لەوەی ئەندامانی تری خێزان فێری بەکارهێنانی مەی نەبن.

١٣- کاریگەرکردنی ڕۆڵی پیاوانی ئاینی و کەسانی ڕۆشنبیر بۆ هۆشیارکردنەوەی تاکەکانی کۆمەڵ لەرووی زیانەکانی خواردنەوە لەسەرجەم رووەکانەوە..

١٤- ڕێکخراوەکانی گەشەپێدانی مەدەنی و سەنتەرەکانی گەنجان و خوێندکاران و قوتابیان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانن رۆڵی گەورە بگێرن لەڕێگەی هۆشیارکردنەوەی تاکەکانی کۆمەڵ و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتە کۆمەڵایەتیانەی لەئەنجامی بەکارهێنانەوە دەکەونەوە.

تێبینی: زۆر گرنگە هەموو تاکێك بزانێت لەهەر قۆناغێکی خواردنەوەدا بێت دەتوانێت بەسەرکەوتووی وازبێنێت ئەگەر مەبەستی وازهێنان بێت و ئەو بۆ چونە هەڵەیەی لەنێوان خەڵکیدا هەیە (من تازە ئەلکحول تێکەڵ بەخوێنم بووە! خوێنم پیس بووە! بێ خواردنەوە هەڵناکەم! ئەگەرنەخۆمەوە تێك دەچم!) ئەمانەو

گـەلێك بۆچـوونی هەڵـەی تـر کـەزۆرجار یـان هەنـدێکجار دەبنـە بەربەست لەوەی تـاك بەشـوێن چارەسـەردا بگـەڕێت یـان هەنـدێکجار تاك دەیکاتە بیانوو (پاساو) تـاکو وازنـەهێنێت. هەنـدێك هـەرزەکاری بەسـەزمان بەشانازیەوە دەڵێـت مـن مەشـروب تێکـەڵی خـوێنم بـووە ڕەنگە ئەم وەهمە فرۆشـیارەکان فێریـان کردبێـت تـاکو بڕێکـی زیـاتر بکڕێت و ڕەواجی زیاتر بداتە کاسبیەکەیان.

پۆلێنکردنی مادەهۆشبەرەکان:

زیاتر لەشێوازێك هەیە بۆ پۆلێنکردنی مادە هۆشـبەرەکان ڕەنگـە ئەمەی خوارەوە گونجاوترینیان بێت:

١- مادەهۆشبەرە سروشتیەکان: وەکو ئەو مادانەی لەرووەکی قـەنب و خەشخاش و کوکا و قات دا هەن.

٢- مـــادە هۆشـــبەرە نیمچـــە دروســـکراوەکان (نیمچـــە بەرهەمهێنراوەکان): وەکو مۆرفین و کوکایین و کودایین.

٣- مـادە هۆشـبەرە دروسـتکراوەکان (بەرهـەمهێنراوەکان): وەکـو هالۆسنۆجینەکان و خەوێنەرەکان و ئازارشکێنەکان و بەهەڵمبوەکان.

بـــەپێ مـــانوەڵی دەستنیشـــانکردن و ئامـــارکردنی نەخۆشـــییە دەرونیەکان چاپی پێنجەم ئەم مادانە بۆ (١٠) جۆر پۆلین دەکات بـەم جۆرەی خوارەوە:

١- پەشێویەکانی بەکارهێنانی ئەلکحول.

٢-پەشێویەکانی پەیوەندار بە کافایین.

٣-پەشێویەکانی پەیوەندر بە حەشیش.

٤- پەشێویەکانی پەیوەندار بە مژادە هەلوسەکان

٥- پەشێویەکانی پەیوەندار بەمژادە هەڵمژەکان.

٦- پەشێویەکان پەیوەندار بە ئەفیون.

٧- پەشێویەکانی پەیوەندار بە هێورکەرەوەکان و خەوێنەرەکان و دژەدلەروکێیەکان.

٨- پەشێویەکانی پەیوەندار بە چالاککەرەکان(ووزەبەخشەکان)

٩- پەشێویەکانی پەیوەندار بەتوتن.

١٠- پەشێویەکانی پەیوەندار بە مژادێکی تر – مژادێکی نەناسراو

پەشێویەکانی نەبوونی پەیوەندی بە مژادەوە

هۆکاری بەکارهێنان چیە؟

هەموو کۆکین کەئەم مادانە زیانی زۆر و بکوژیان لەسەر لایەنی تەندروستی و کۆمەلآیەتی و ئاینی و ئابوری تاك هەیە. کەواتە بۆ بەکاردەهێنرێت؟

١) پەروەردەی خراپ و بێ ئاگایی باوان لەمنداڵەکانیان و نەبونی کاتی پێویست بۆ ئاخاوتن و بەئاگابوون لەکێشەو گرفتی منداڵەکان بەتایبەتی تەمەنی هەرزەکاری و پێنەدانی هۆشیاری بەمنداڵەکان لەمەڕ زیانەکانی ئەم مادانە و بێئاگابوون لەوەی هاورێیەتی کێ دەکەن؟.

٢)پەرتەوازە بوونی خێزان بەهۆی جیابونەوە، تەلاق، مردن. لەحاڵەتی تەلاقدا هەر یەکە لەباوان بەرپرسیارێتیەکە دەخاتە ئەستۆی ئەویتر یان هەوڵدەدات دڵی منداڵەکە بۆ خۆی رابکێشێت بەشێوەیەکی هەڵە بەوەی هەڵەکانی بۆ داپۆشێت و یان هاندانی بۆ هەڵەکردن وەك تۆڵەیەك لەتاکی بەرامبەر.

٣)لاوازی سستمی پەروەردە و فێرکردن بەوەی بابەتی پێویست لەخۆناگرێت لەمەر کاریگەری و زیانەکانی ئەم مادانە.

٤)لاسایی کردنەوەی کەسانی گەورەتر کەپێشەنگن لەم کارەدا باوك، برا، هاورێی خراپ. هەندێکجار هاندانیان لەلایەن ئەو کەسانە بەشێوەی ناڕاستەوخۆ وەك باس کردن لەتام وجۆرەکانی ئەم مادانە کامیان باشە وکامیان خراپە، بەشێوەی ڕاستەوخۆ وەك بەشداریپێکردنیان لەبەکارهێناندا یان دەستخۆشی لێکردنیان لەکاتی بەکارهێناندا و هەندێکجار فشارخستنە سەریان بۆ بەکارهێنان.

٥)خۆش گوزەرانی و نەزانینی سەرفکردنی پارە و ئارەزووی تاقیکردنەوە. بەتایبەتی ئەگەرتاك لەماوەیەکی کورتدا گۆڕانکاری ئابوری گەورەی بەسەردا هاتبێت و بێئاگابێت لەمەترسی ئەم مادانە.

٦)بۆچوونی هەڵە سەبارەت بەپەیوەندی ئەم مادانە بەسێکسەوە، هەندێك لەو باوەڕەدان ئەم مادانە توانا و ئارەزووی سێکسی زیاد دەکات بەڵام سەرجەم سەرچاوە زانستیەکان کۆکن لەوەی ئەم مادانە کاریگەری گەورەی هەیە لەدابەزاندنی توانا و ئارەزووی سێکسی.

٧)بۆچونی هەڵە سەبارەت بەپەیوەندی ئەم مادانە بەزیادکردنی توانای خوێندن و بیرکردنەوە دوور نیە کەسانێك هەبن بانگەشەی ئەمە بکەن و هەندێك کەسیان کردبێتە نێچیری ئەو تاوانە گەورەیەو توشی ئالودەبون ببن. هەندێکجار خودی خێزان ڕێخۆشکەرە بۆ هاندانی یەکێك لەئەندامەکانی بۆ ئەم کارە کاتێك فشاری زۆر دەخەنە سەر منداڵەکانیان بۆ بەدەستهێنانی نمرەی بەرز و کەسانێکیش هەن بانگەشەی کاریگەری ئەم مادانە دەکەن لەسەر توانانی بیرکردنەوە.

٨)مەرایکردنی (رازیکردنی) کەسانی تر بۆ تاقیکردنەوە. بەتایبەتی ئەگەرتاکی بەرامبەر کەسێکی بەرپرس بێت و بەکاربەری ئەو مادانە بێت و فەرمووی لێبکات.

٩)بەکارهێنانەوەی دەرمانەکە بۆ ماوەیەکی درێژتر لەوەی پزیشك دەینوسێت.

١٠) هەندێکجار بەهۆی هەڵەی پزیشکەوە کەبۆ ماوەیەکی درێژتر لەپێویست دەرمانەکە دەداتە نەخۆش.

١١) لاوازی چاودێری بەکارهێنانی ئەم مادانە لەلایەن وەزارەتی تەندروستی و بوونی ئەم مادانە لەسەرجەم یان لەزۆربەی دەرمانخانەکان و شوێنەکانی فرۆشتنی دەرمان و زۆرجار پێدانیان بەتاك بەبێ ڕەچەتەی پزیشکی.

١٢) بوونی پەشێویە دەرونیەکان وەکو خەمۆکی و سکیتزۆفرینیا و دڵەراوکێ.

١٣) ڕاگەیاندن، پیشاندانی ئەو کەسانە بەکەسێکی بەتواناو بەهەڵوێست، هەندێکجار نیشاندانی بەکارهێنانی ئەم مادانە وەك ڕێگا چارەیەك بۆ گرفتەکان بەتایبەتی گرفتی سۆزداری یان گرفتە ئابوریەکان بەڵام هەموان کۆکین لەوەی ئەم مادانە جگە لەزیادکردن و ئاڵۆزکردنی گرفتەکان هیچیان پێ چارەسەر ناکرێت.

١٤) لاوازی هۆشیاری ئاینی و بێئاگایی لەحەرامی ئەم مادانە و لاوازی وەزارەتی ئەوقاف و مامۆستایانی ئاینی لەهۆشیارکردنەوەی تاکەکانی کۆمەڵ.

١٥) بەتاڵی و بێکاری و نەزانینی پڕکردنەوەی کاتەکان بەشتی بەسوود.

١٦) پەنابردنە بەر ئەم مادانە لەکاتی بوونی فشار و کێشەی کۆمەڵایەتی بەئومێدی ڕزگاربوون لەکاتێکدا هەموو کۆکین ئەم مادانە گرفتەکان ئاڵۆزتر دەکات.

١٧) لاوازی دەزگاکان و بەرفراوانی سنوور و بوونی چەند وڵاتێکی دراوسێ کەهەموویان بەدەست گرفتی ئالودەبونەوە دەناڵن و دوور نیە لەڕێگای دەزگا و باندەکانیانەوە بەفەرمی یان نا فەرمی هەوڵی بازاڕ پەیداکردن بدەن بۆ ژەهرەکانیان. بیرمان نەچێت بازرگانی کردن بەم مادانەوە پەیوەندی پتەوی بەباری سیاسی و ئاسایشی وڵاتانەوە هەیە.

١٨) هەرزانی نرخ و بەئاسان بەدەستکەوتن بەتایبەتی لەناوچە سنوریەکان.

**١٩) بونی کرێکاری بیانی لەووڵاتدا کەبەکاربەری ئەم مادانە بن یان گەشتکردن و کارکردن لەو وولاتانەی بەدەست ئەم گرفتەوە دەناڵێن ئەگەری بەکارهێنان زیاتر دەکات.**

**هەندێکجار بەبێ ئەوەی تاك بەخۆی بزانێت لەلایەن کەسانی ترەوە بەنهێنی ئالودە دەکرێت کاتێك بۆ ماوەیەك یەکێك یان زیاتر لەو مادانەی بۆ دەکرێتە ناو خواردن یان خواردنەوە و بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت ئالودە دەبێت کاتێك دەیەوێت سەردانی ئەو شوێنە نەکات یان خواردنی ئەو شوێنە نەخوات نیشانەکانی لێگرتنەوەی تیا بەدەردەکەوێت.**

چارەسەر:

**چارەسەرکردنی کەسی ئالودەبوو کارێکی ئاسان نیە یەکەم لەبەرئەوەی ئەم ئالودەبونە بەنهێنی دەکرێت و زۆرجار تاك نایەوێت وازبهێنێت و لەژێر فشاری کەسوکاریدا بەم کارە هەڵدەستێت، دووەم ئەگەری گەڕاندنەوە بۆ ئالودەبوون ڕێژمیەکی بەرزە و بەپێی جۆری مادەکان و ئاسانی بەدەستهاتن و هۆکاری وازهێنانەکە دەگۆڕێت. بۆیە ڕەزامەندی و باوەڕی تەواوی تاك بەوازهێنان و خراپی و زیانەکانی ئالوەبوون زۆر گرنگە و بەبەردی بناغەی چارەسەر دادەنرێت.**

چارەسەر بەسێ قۆناغ دەکرێت:

١- قۆناغی رزگاربوون (پاککردنەوە) لەژەهراویبوون:

کە پزیشك رۆڵی گەورەی تیادەگێرێت و لەرێگەی بەرکارهێنانی هەندێك دەرمانەوە ئازار و نارەحەتیەکانی لێگرتنەوە کەمدەکرێتەوە و هاوکاری تاك دەکرێت بۆ تێپەراندنی ئەو قۆناغە بەسەرکەوتوویی. زۆر جار چەند رۆژێك بۆ ٢ هەفتە دەخایەنێت.

٢-قۆناغی چارەسەری دەرونی و کۆمەلایەتی:

ئەم قۆناغە چارەسەری دەرونی تاك و رێنمایی خێزانی دەگرێتەوە بۆ هاوکاری تاکی ئالودەبوو، هەوڵدەدرێت تاك رابهێنرێت لەسەر

- چۆنێتی بریاردان.
- هونەری چارەسەری کێشە.
- بەرەنگاربونەوەی فشارەکانی ژیان.
- هونەری خۆخاوکردنەوە و نوستنی دروست.
- دروستکردنی پەیوەندی نوێ و ماڵئاوایی لەپەیوەندیە کۆنە زیانبەخشەکان.
- چارەسەرکردنی هۆکار و پاڵنەری سەرەکی بۆ ئالودەبوون.
- راهێنانی تاك لەسەر چالاکی کۆمەلاتی و گەراندنەوەی بۆ ناو کۆمەڵ.
- وەرزشکردن بۆ گەراندنەوەی توانای جەستەیی تاك.

لەپرۆسەی چارەسەردا پێویستمان بەشوێنێکی ئارام و سەلامەت و پاڵپشتی دەرونی و خێزانی هەیە.

۳-قۆناغی ڕاهێنانەوە و چاودێری دواتر:

**ئەم قۆناغەش دەکرێت بەسێ هەنگاوەوە:**

هەنگاوی یەکەم:

**هەنگاوی ڕاهێنانەوەی کرداری: ئامانج لەم هەنگاوە گەڕاندنەوەی توانای تاکە لەبواری کار و پیشەکەیدا و چارەسەرکردنی ئەو ڕێگریانەیە کەئاستەنگن لەبەرامبەر گەڕاندنەوەدا.**

هەنگاوی دووەم:

**هەنگاوی ڕاهێنانەوەی کۆمەڵایەتی: ئامانج لەم قۆناغە گەڕاندنەوەی تاکە بۆ ناو خێزان و کۆمەڵگە و پتەوکردنی پەیوەندیەکی دروستە لەنێوان تاك و دەوروبەر، بۆ گەڕاندنەوەی متمانە و باوەڕ بۆ تاکی ئالودەبوو.**

هەنگاوی سێیەم:

**هەنگاوی پاراستن لەنوشست: مەبەست لەم قۆناغە چاودێری و بەئاگابوونە لەتاك نەك بگەڕێتەوە سەرهەمان ڕەفتاری پێشوی و لەکاتی ئەم حاڵەتەدا خێرا چارەسەری پێویستی بۆبکرێت.**

لێرەدا زۆر گرنگە وەڵامی دوو پرسیار بدەینەوە،

**یەکەمیان باوان (ئەندامانی خێزان) چۆن سیفەتەکانی یەکێك بناسنەوە کەئالودەبووە؟**

**دووەمیان ئەرك و ڕۆڵی باوان (ئەندامانی خێزان) چیە لەرێگرتن لەبەکارهێنانی مادەی هۆشبەر؟**

بۆ وەڵامی پرسیاری یەکەم دەتوانین ئەم چەند خاڵەریزبەند بکەین:

**١- گۆڕانکاری چاوەڕواننەکراو لەڕەفتاری تاکدا بەلای نەرێنیدا.**

**٢-شپرزەیی و دابڕان لەکار و خوێندنگە و پشتگوێخستنی کارەکان.**

**٣-گرفت لەڕێکخستنی کات و نەبونی خشتەی کار و چالاکی و نارونی لەکاتەکانی هەستان و دانیشتن و چونەدەرەوە و هاتنەوەدا.**

**٤-کەمبونەوەی پلەبەپلەی ئارەزووی خواردن.**

**٥-بونی ئاسەواری دەرزی لەسەر جەستە و بونی سرنج و هەندێك پێویستی تر لەژورەکەیدا و زۆرجار هەوڵدەدات پۆشاکی قوڵ کورت لەبەر نەکات تاکو شوێنی دەرزی لێدانەکان بەدەرنەکەون.**

**٦-زۆرچوونە دەرەوە لەماڵ و لەکاتی گوماناویدا.**

**٧-کەمبونەوەی توانای بەرهەمهێنان لەبواری کار یان خوێندن.**

**٨-دوور کەوتنەوە لەهاورێ کۆنەکانی بەبیانوی بێ پاساو و پەیداکردنی هاورێی نوێ کەهاوشێوەی خۆی بن.**

**٩-هێنانەوەی بیانوی جۆراوجۆر بۆ بەدەستهێنانی پارە و هەندێکجار دەستبردن بۆ پارەی کەسانی تر بەبێ ئاگایی ئەوان.**

**١٠- دانپێدانانی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەبەکارهێنان.**

**سەبارەت بەپرسیاری دووەم ڕاستە بەرەنگاربونەوە و ڕێگرتن ئەرکی هەموانە و کۆمەڵێکی زۆر لەوەزارەتەکانی حکومەت پەیوەندارن بەم کێشەیەوە بەڵام هەمیشە رۆڵی خێزان کاریگەری**

گەورەی هەیە و دەتوانین بەهەمان شێوەی وەڵامی پرسیاری یەکەم هەندێك ڕاستی بنوسین:

١- هەستانی باوان بەرۆڵی خۆیان وەك دایك و باوك نەك وەك دوو کەسی باڵادەست کەمنداڵ نەتوانێت پرسیار و نهێنیەکانی ژیانیان بۆ باس بکات.

٢- بایەخدان بەمنداڵەکانیان و هاوەڵی کردنیان بۆ گەشت و سەردانەکان.

٣- ناسینی هاوەڵی منداڵەکانیان لەرێی ئەوەی سەردان هەبێت لەنێوانیان و پەیوەندیەکان لەپەیوەندی دوو کەسەوە بۆ پەیوەندی دوو خێزان باڵا بکرێت تاکو بزانن منداڵەکانیان هاوەڵی چ جۆرە کەسێك دەکەن.

٤- پێدانی زانیاری لەمەر زیانەکانی مادەهۆشبەرەکان و مەترسیە تەندروستی و کۆمەڵایەتی و یاساییەکانی بەکارهێنان.

٥- بایەخدان و هاندانی لایەنی رۆحی منداڵەکانیان.

٦- ئاگادارکردنەوەی منداڵەکانیان لەو شێوازانەی بازرگانەکانی مادەهۆشبەرەکان بەکاریدێنن بۆ بایەخدان و رەواجدان بەکارەکان و ڕاستکردنەوەی بۆچوونە هەڵەکان سەبارەت بەمادەی هۆشبەر.

٧- لەرێگەی چیرۆك و گێرانەوەی بەسەرهاتنی ئالودەبوان هەر لەمنداڵیەوە ئەم مادانەی لا قێزەوون بکرێت.

٨- زۆر گرنگە باوان و ئەندامانی خێزان خۆیان بەکاربەر و ئالودەی مادەی هۆشبەر نەبن.

٩- کەمکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەس و خێزانانەی بەکاربەری مادەهۆشبەرن و مەترسی ئەوەیان هەیە کاریگەریان هەبێت لەسەر منداڵەکانت.

١٠- هەوڵدان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری ئەندامانی خێزان لەڕێگەی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن و بڵاوکراوەکان (پۆستەر و نامیلکە و کتێب)

ئیسلام چۆن چارەسەری دەکات؟

وەك ئاشکرایە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دوو سەرچاوەی گرنگی هەیە بۆ یاسادانان سەرچاوەی یەکەم قورئانە و دووەمیش فەرمودەکانی پێغەمبەرە. (درودی خوای لەسەر بێت)

قورئان زۆر بەشێوەیەکی جوان و وورد باس لەچۆنێتی چارەسەرکردنی ئەم گرفتە دەکات بۆ ئەم مەبەستەش هەنگاوەکانی وازهێنان دەکات بەچوار قۆناغەوە.

**قۆناغی یەکەم:**

لەرێی پێشەنگی باشەوە و بەبێ ئەوەی ڕاستەوخۆ لەکرۆکی بابەتەکە بدات بۆیە دەفەرموێ ﴿لقد كان لكم في رسول الله أسوه حسنه﴾ (الاحزاب ٢١)

ئاشکراشە کەپێغەمبەری خوا مەی نەخواردۆتەوە و حەزی بەبەکارهێنانی نەکردووە. لێرەدا قورئان ڕاستیەکی زانستی گرنگ

دەخاتـە روو ئـەویش شـوێن کـەوتنی کەسـانی پێشـەنگە واتـە لاسـایی کردنـەوەی کەسـانی تـر لەکاتێکـدا ئـەو کەسـەت بـەدڵ بێـت. بۆیـە پێغەمبەری خوا(درودی خـوای لەسـەر بێـت) دەکاتـە پێشـەنگ و داوا لەموسولمانان دەکات چاو لەو بکەن لەرەفتارەکانیاندا. دیارە تەنها بەم هـەنگاوە کەسـانێك هـەن وازدێـنن لەکاتێکـدا دەبیـنن پێشـەنگەکەیان ناخواتەوە.

بۆیە دەزگا بەرپرسەکان دەتوانن پشت بەو کەسانە ببەستن کەلە کۆمەلگەدا پێگەیەکی دروست و ناوبانگیان هەیە (کەسـایەتی ئـایینی، هونەرمەندان، رۆشنبیران، سیاسەتمەداران) کەبەکاربەری ئـەو مادانـە نـین بـۆ بانگەشـەکردن و بەرەنگاربوونـەوەی ئـەم مادانـە. تـاکو وەك پێشەنگێکی سەرکەتوو کەسانی تر لاسایی بکەنەوە.

قۆناغی دووەم:

﴿ویسئلونك عن الخمر والمیسر قل فیهما اثم کـبیر ومنـافع للنـاس واثمهما اکبر من نفعها﴾ (سورة البقرة ٢١٩)

لێرە قورئـان بـاس لـەزیانی خواردنـەوە دەکـات و لەهـەمان کاتـدا دەڵێت برێك سودیشی هەیـە بـەلام زیانـەکانی لەسـوودەکانی زیـاترە، ئەمـە پەیامێکـە بـۆ ئەوانـەی دەیانـەوێت وازبێـنن هـەر بـەم قۆناغـە برێکـی بـاش لەوانـەی پـەیامی قورئـانی تێدەگـەن وازدێـنن خۆیـان لەزیانـــەکانی دەپـــارێزن. لێـــرەدا خـــوای میهرەبـــان ووشـــەی (اثـــم) بـــەکاردێنێت نـــەك (ضـــرر) چـــونکە زیانـــەکانی ئـــەلکحول تـــەنها

جەستەیی نیە بەڵکو زیانی جەستەیی و دەرونی و کۆمەڵایەتی و مادی هەیە و سەرپێچیە لەفرمانی خوای میهرەبان.......

لەم قۆناغەدا رۆڵی گەورەی وەزارەتی تەندروستی و کارمەندەکانی بەدەردەکەون لە رێی کۆڕو سیمینار و بەرنامەی تەندروستی سەبارەت بە زیانەکانی ئەم مادانە لەرووی تەندروستەیەوە.

هەروەها رۆڵی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی و رێکخراوەکانی گەشەپێدانی مەدەنی لەم قۆناغەدا زۆر گرنگە بۆ باسکردن لە زیانە کۆمەڵایەتی و ئابووری و کەسێتیەکان.

هەروەها رۆڵی وەزارەتی ناخۆ و دەزگا ئەمنیەکان و وەزارەتی داد بۆ هۆشیارکردنەوەی تاکەکان سەبارەت بە زیان و سزا یاساییەکانی بەکارهێنانی ئەم مژادانە.

قۆناغی سێیەم:

لێرەدا بازنەکە لەسەر موسوڵمان تەسك دەکاتەوە لەئایەتی (٤٣) سورەتی (النساء) دا دەفەرموێ ﴿لاتقربوا الصلاة وأنتم سكرى حتى تعلموا ما تقولون﴾.

لەهەمان سورەتدا ئایەتی (١٠٣) دەفەرموێت ﴿ان الصلاة كانت على المؤمنين كتابا موقوتا﴾

بۆیە تاکی بڕوادار بواری خواردنەوەی زۆر تەسك دەبێتەوە چونکە لەرۆژێکدا پێنج جار نوێژ دەکات و دەبێت نوێژەکان لەکاتی

خۆیــدا بکــات و واباشــترە بەکۆمــەڵ بیکــات و بــەڵکو بــۆ هەنــدێك هەردەبێت بەکۆمەڵ بیکات، کەواتە ئەو کاتە نامێنێتەوە بۆ تاك تاکو بخواتەوە.

بۆیــە ( ئیمـامی عومــەر) دەسـت بەرزدەکاتــەوە بـۆ پــەروەردگار و دەڵێت:

خوایــە گیــان ســەبارەت بەخواردنــەوە رێنماییــەکی ئاشــکرامان بکەیت.

زۆر گرنگە لەم قۆناغـەدا شوێن و کـاتی فرۆشـتنی ئـەم مژادانـە ســـنورداربکرێت (بەتایبـــەتی ئـــەلکحول چـــونکە بـــە ئاشـــکرا بەکاردەهێنـرێت و رێگری یاسایی نیـە) ئەمـەش دەبێتـە رێگـری بـاش لەبەردەم هەندێك هەرزەکاردا.

**<u>قۆناغی چوارەم:</u>**

﴿یا أیها الذین آمنوا إنمـا الخمـر والمیسـر والأنصـاب والأزلام رجس من عمل الشیطان فاجتنبوه لعلکم تفلحون﴾. (المائدة: ٩٠).

لــەم قۆناغــەدا بەئاشــکرا بــاس لەحــەرامی خواردنــەوە دەکـات هاوشانی دەکات لەگەڵ قومار و بت پەرستی و زاربازی.

ئەمــەش راڤــەی ئــەو دوو ئایەتــەی ســەرەوەیە بەپشـت بەسـتن بەتەفسیری ئاسانی مامۆستا ( بورهـان محمـد ئـەمین) (ئـەی ئەوانـەی کــەباوەڕتان هێنــاوە دڵنیــابن کەعــەرەق و قومــار و گۆشــتی مــاڵاتی سەربراو بۆ غـەیری خـوا لـەو شوێنانەی کەخـەڵك بـەپیرۆزی دانـاوە

نەك ئیسلام، بورج و حەلال و حەرام زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەر پیسن و لەكارو كردەوەی شەیتانن، كەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دووربگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی بەدەست بێنن).

بۆگەیشتن بەم قۆناغە (١٥) ساڵی خایاند تاوێك لەرێگەی پێشەنگی نمونەییەوە كەپێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێت) تاوێك لەرێی بڵاوكردنەوەی زانیاری لەسەر زیانەكانی خواردنەوە و تاوێكی تر بەئاگاهێنان لەنەشیاوی ئەم كارە لەكاتی نزیك نوێژكردندا و نزیك نەبونەوە لەنوێژ بەمەستی و لەدوا قۆناغدا رێگری تەواوەتی.

سەبارەت بەسەرچاوەی دووەم كەفەرمودەكانی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێت) ئەم چەند فەرموودەیە دەخەینە روو:

• پێغەمبەری ئازیز دەفەرموێ: " كل مسكر خمر، وكل مسكر حرام " (أبو داود وأحمد).

واتە هەموو مەستەرێك مەیە و هەموو مەستكەرێك حەرامە.

• هەروەها لەفەرمودەیەكی تردا دەڵێ: " لعن الله الخمر شاربها وساقيها وبائعها، ومبتاعها (مشتريها)، وعاصرها، ومعتقها، وحاملها والمحمولة إليه " (أبو داود) واتە خوا (نەفرەت)ی لەعنەتی كردووە لەمەی، لەوەی دەیخواتەوە و ئەوەی دەیگێرێت و ئەوەی دەیفرۆشێت و ئەوەی دەیكرێت و ئەوەی دەیگوشێت (واتە دروستی دەكات) و ئەوەی دەیگرێتە خۆی (واتە لەكۆگادا هەڵیدەگرێت) و ئەوەی هەڵی

دەگرێت (واتە دەیگوێزێتەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر) و ئەوەشی بۆی دەبرێت.

بەم فەرمودەیەی ( ئەبوداود) دەردەکەوێ کەئیسلام تاکو چ ئاستێك دژی ئەم کارە قێزەونەیە و لەعنەت لەسەرجەم ئەو کەسانە دەکات لەهەر ئاستێدا یان قۆناغێکدا هاوکاری دەکەن بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم کارە.

ئەگەر جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ ئایەتەکەی پێشوو دەبینین هەردوو جار کەباسی مەی دەکرێت لەگەڵ قوماردا ناوی دەربرێت و لەجاری دووەمدا هاوشان دەکرێت لەگەڵ قومار و بت پەرستی و زار بازی (هەڵدانی زار).

• لەفەرموودەیەکی تردا مەی مەخۆرەوە چونکە کلیکلی هەموو شەرێکە "لا تشرب الخمر فإنها مفتاح كل شر" (ابن ماجة و الحاكم).

• لە فەرموودەیەکی تردا باس لەوە دەکات ئەگەر یەکێك مەی بخواتەوە و مەست ببێت هەتا چل رۆژ نوێژی قبول نابێت و ئەگەر بمرێت دەچێتە دۆزەخەوە، ئەگەر تەوبە بکات خوا لێی خۆش دەبێت، هەتا سێجار ئەمە دەڵێتەوە و لەجاری چوارەمدا دەڵێت ئەگەر گەرایەوە سەر خواردنەوە ئەوە مافی خوایە بیخاتە دۆزەخ و لە گوشراوی ئەهلی ئاگر خواردنەوەی بداتێ.

" من شرب الخمر وسكر لم تقبل له صلاة أربعين صباحا، وإن مات دخل النار، فإن تاب تاب الله عليه، وإن عاد فشرب فسكر لم

تقْبَلْ لهُ صلاةٌ أَرْبَعِين صباحًا، فإنْ ماتَ دخلَ النّارَ، فإنْ تابَ تابَ اللهُ عليْهِ، وإنْ عادَ فشَرِبَ فسَكِرَ لمْ تقْبَلْ لهُ صلاةٌ أَرْبَعِين صباحًا، فإنْ ماتَ دخلَ النّارَ، فإنْ تابَ تابَ اللهُ عليْهِ، وإنْ عادَ كانَ حقًّا على اللهِ أنْ يَسقِيَهُ منْ رَدغَةِ الخَبالِ يوْمَ القِيامةِ". قالوا: يا رسول الله، وما ردغةُ الخبالِ؟ قال: "عُصارةُ أهلِ النّارِ(أبو داود عن ابن عباس: كتاب الأشربة، باب النهي عن المسكر (٣٦٨٠)، والترمذي (١٨٦٢) وقال: هذا حديث حسن. وابن ماجه (٣٣٧٧)، والدارمي (٢٠٩١)، وأحمد (٦٦٤٤)، والحاكم (٧٢٣٢).

● كاتێك هاوەڵێك لێی دەپرسێت وەك دەرمان بەكاربهێنرێت پێی دەفەرموێت (ئەوە نەخۆشیە نەك دەرمان) " إنّهَا داءٌ، وليْستْ بِدواءٍ" (احمد)

● لەفەرموودەیەكی تردا وەك بەسەرهاتێك باس لە ئومەتەكانی پێشتر دەكات كاتێكك پیاوچاكێك ئافرەتێكی لەشفرۆش دەیەوێت فریوی بدات بانگی دەكات بۆ ماڵەكەی بە ناوی كاری چاكەوە بەڵام كە دەچێتە ژوورەوە دەرگاكانی لەسەر دادەخات پێی دەڵێت دەبێت یەكێك لەم سێ كارە بكەیت خواردنەوەی مەی، كاری سەرجێی لەگەڵم، یان كوشتنی ئەم منداڵە، ئەویش بریاری خواردنەوەكە دەدات بەڵام هێندە دەخواتەوە تا مەست دەبێت دواتر ئاگای لەخۆی نابێت زیناكەش دەكات و پاشان منداڵەكەش دەكوژێت.

فعن عثمان بن عفان، عن النبي أنه قال: "اجتَنِبُوا الخمْرَ؛ فإنّها أمُّ الخبائِثِ، إنّهُ كانَ رَجُلٌ مِمّنْ خلا قبْلَكُمْ تعبّدَ، فعَلِقتْهُ (١٢) امرأةٌ

غويةٌ، فأرسلت إليهِ جاريتها، فقالت لهُ: إنّا ندعوكَ للشهادةِ. فانطلقَ معَ جاريتِها، فطفقتْ كلّما دخلَ بابًا أغلقتهُ دونهُ، حتى أفضَى إلى امرأةٍ وضيئةٍ عندها غلامٌ وباطيةُ) خمرٍ، فقالت: إنّي واللهِ ما دعوتكَ للشهادةِ، ولكن دعوتكَ لتقعَ عليّ، أوْ تشربَ منْ هذهِ الخمرةِ كأسًا، أوْ تقتلَ هذا الغلامَ. قالَ: فاسقيني منْ هذا الخمرِ كأسًا. فسقتهُ كأسًا، قالَ: زيدوني. فلمْ يرمْ حتى وقعَ عليها، وقتلَ النفسَ، فاجتنبُوا الخمرَ؛ فإنّها واللهِ لا يجتمعُ الإيمانُ وإدمانُ الخمرِ إلاّ ليُوشكُ أن يُخرِجَ أحدُهُما صاحبَهُ (النسائي)

• **لەفەرمودەیەکی تردا دەفەرمویت ئەوەی بڕە زۆرەکەی مەستت بکات کەمەکەشی حەرامە " ما أسكر كثيره، فقليله حرام"** (سنن أبي داود، رقم: ٣٦٨١).

• **لە فەرمودەیەکی تردا زۆر بەجوانی روونی دەکاتەوە کە مەی لە پێنج شت دروست دەکرێت وحەرامە ئەو پێنج شتەش ( تری و خورما و هەنگوین و گەنم و جۆ) یە ( بوخاری ٤٦١٩)**

سمعتُ عمر - رضي الله عنه - على منبر النبي - صلى الله عليه وسلم - يقول: "أمّا بعد، أيها الناس، إنه نزل تحريم الخمر، وهي من خمسة: من العنب، والتمر، والعسل، والحنطة، والشعير، والخمرُ ما خامر العقل"؛ (صحيح البخاري، رقم: ٤٦١).

• **کاتێک هاوەڵێک لێی دەپرسێت کە لە شوێنێکی سارد کار دەکەن وبەهۆی ئەم گیراوەیەوە دەتوانن کاری قورس بکەن، پێغەمبەر (د.خ) ئێی دەڵێت ئایا مەست دەکات؟ ووتی: بەڵێ،**

**پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ پێی فەرموو کەواتە لێی دوور کەونەوە، هاوەڵەکە پێی دەڵێت: بەڵام خەڵکی وازی لێناهێنن، پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ پێی فەرموو: ئەگەر وازی لێناهێنن بجەنگن لەگەڵیان.** " عن ديلم الحميري أنه قال: سألت رسول الله - صلى الله عليه وسلم - فقلت: يا رسول الله، إنا بأرض باردة نعالج فيها عملاً شديداً، وإنا نتخذ شرابنا من هذا القمح نتقوى به على أعمالنا وعلى برد بلادنا، قال: هل يُسكر؟، قلت: نعم، قال: فاجتنبوه، قال: قلت: فإن الناس غير تاركيه، قال: فإن لم يتركوه، فقاتلوهم، (سنن أبي داود، رقم: ٣٦٨٣، صححه الألباني).

**هەروەها لەقۆناغی مەککەدا کەهێشتا خواردنەوەی مەی حەرام نەکرابوو لەقورئاندا لەریزی رزقی باشدا ناوی نابات بۆیە لەسورەتی (النحل) دا ئایەتی (٦٧) دەفەرموێت:** ﴿وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا...﴾.

له بەروبوومی خورما و ترێ دەستتان دەکەوێت مەستی و رزقی باش واته مەست بوون بە رزقی باش و کاری باش ناوبەنراوە.

## خۆكوژی ( خۆكوشتن )

رەفتاری خۆكوشتن دەكرێت بە پێنج ئاست:

١- بیری خۆكوشتن: **تاك بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بیر لەوە دەكاتەوە كەخۆی بكوژێت بەلاّم ڕەفتاری خۆكوشتنی نییە.**

٢- هەرەشە كردن بەخۆكوشتن: **لەڕێگەی قسەكردن یان نوسینەوە هەڕەشەی خۆكوشتن دەكات بەلاّم بەكردەوە هیچ ناكات.**

٣- ڕەفتاری خۆكوژی: **هەڵدەستێت بەهەندێك ڕەفتار دڵنیایە نابێتە هۆی مردن وەكو خواردنی بڕێك دەرمان كەزیاترە لەبری چارەسەر بەلاّم ناگاتە ئاستی خۆكوشتن.**

٤- هەوڵی خۆكوشتن: **زیان بەخۆی دەگەیەنێت دەشێت ببێتە هۆی برینی بچوك یان گەورە. وەكو برینداركردنی چەند شوێنێكی خۆی.**

٥- خۆكوشتنی تەواوەتی: **كەسەكە بەتەواوی كۆتایی بەژیانی خۆی دێنێت بەهەر ڕێگەیەك بێت سوتان، دەرمان خواردن، بەكارهێنانی دەمانچە، خۆخستنە خوارەوە لەشوێنێكی بەرز... هتد.**

گەمەی خۆكوشتن: **هەڵدەستێت بەخواردنی بڕێك دەرمان كەدەگاتە ئاستی بكوژی بەلاّم دڵنیایە یەكێك فریای دەكەوێت پێش ئەوەی بمرێت، ئەگەر كەسێك فریای نەكەوێت دەبێتە هۆی مردن.**

خۆکوشتنی درێژ خایەن: بریتییە لەخۆکوشتن لەڕێگەی بەکارهێنانی مەی و جگەرە کێشان و ئالوودەبوون بەبەکارهێنانی دەرمان.

خۆکوشتنی بەکۆمەڵ: لەم حاڵەتەدا کۆمەڵە کەسێك پێکەوە هەڵدەستن بەخۆکوشتن وەکو ئەو هۆزە ئۆغەندییەی لەسەر مەزهەبی کاسۆلیك بوون لەڕێگەی قەشە ( جۆزیف کیبۆتبیرد) وایان دەزانی لەبەرواری (١٩٩٩/١٢/٣١) قیامەت هەڵئەسێت واپێویست دەکات خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەهەشت. لەمارسی (٢٠٠٠) دا هەمان گروپ (٥٣٠) جەستەی مردوویان لەیەکێك لەکەنیسەکانی (کانونجو) دۆزرایەوە و پاشان گۆڕی بەکۆمەڵی تر دۆزرایەوە تاکو ژمارەیان گەیشتە زیاتر لە (١٠٠٠) خۆکوژ.

لەساڵی (١٩٧٨) دا لەشوێن کەوتوانی (جیم جونز) (٩١٨) کەسیان خۆیان کوشت بەمادەی سیانید.

هۆکارە ترسناکەکانی خۆکوشتن:

بێگومان ئەگەری خۆکوشتن لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی هەیە و کۆمەڵێك هۆکار هەن ئەگەری ئەم ترسناکییە زیاد یان کەم دەکەن، گرنگترینیان بریتییەلە:

١- ڕەگەز: هەوڵی خۆکوشتن لەمێینەدا زیاترە وەك لەنێرینە بەڕێژەی سێ هێندە، خۆکوشتنی تەواوەتی لەنێرینەدا زیاترە وەك لەمێینە بەڕێژەی چوار هێندە.

٢- تەمەن: لەهەمووتەمەنێکدا ڕوودەدات، هەرزەکاری و سەرەتای لاوێتی ترسناکترین قۆناغن، هەروەها لەدوای تەمەنی (٦٥ساڵی) ئەگەری خۆکوشتن زۆر زیاد دەکات بەتایبەتی لەو پیرانەی کەبەتەنیا دەژین ونەخۆشی درێژخایەنیان هەیەو لەڕابردووی خۆیان ڕازی نین و ئومێدیان بەئاینده نەماوە.

٣-ئایین: گومانی تێدا نییە سەرجەم ئایینەکان پەیامی ژیانیان پێیەو دژی خۆکوشتنن بەپێی ئایینی هندۆسییەکان ئەوەی دەمرێت تەنها لاشەیە، گیان نامرێت.

لەتەوراتدا باس لەوە دەکات کەخوا مرۆڤی ئازاد کردوە بۆهەڵبژاردن لەنێوان خواردنی بەری درەختی نەمری و بەری درەختی زانیاری بۆ زانینی چاکە وخراپە لەگەڵیدا مردن و بەرپرسیارێتی مرۆڤیش زانیاری هەڵبژارد.

لەمەسیحیەتدا باس لەوە دەکات کەهەڵبژاردنی ئەم درەختە هەرەمەکی نەبووە، بەڵکو پێویستیەکی بابەتیانە بووە چونکە مرۆڤ پێویستی بەئازادییەو ئازادیش ئەگەری گوناە کردن دروست دەکات وگوناە کردنیش بنەمایە بۆ مردن بۆیە دەبێت مرۆڤ کار بکات بۆلەناو بردنی گوناهەکانی لەڕێگەی لەناوبردنی مردنەوە.

لەئیسلامدا باس لەحەتمیەتی مردن دەکات و هەموو نەفسێك دەبێت بمرێت هەموو مردنێك بەفرمانی پەروەردگار و خۆکوشتنیش گوناهێکی گەورەیە. لەقورئاندا لەسورەتی (النساء، ٢٩) ( ولاتقتلوا انفسکم ان الله کان بکم رحیما) واتە خۆتان مەکوژن خوا بەبەزەییە بەرامبەرتان.



بەپێی ئەو سەرژمێریانەی کەدورکایم تۆماری کردوون ڕێژەی خۆکوشتن لەکاسۆلیك دا کەمترە وەك لەپرۆتستانت بۆنمونە:

ڕێژەی خۆکوشتن لەئیتالیادا (١,٧ کەس) , لەئێرلەندا (٢,٣ کەس) لەئیسپانیا (٥,٩ کەس) بۆ هەر (١٠٠,٠٠٠کەس) لەم وولاتانەدا مەزهەبی کاسۆلیك بالاَ دەستە. لەسوێد ڕێژەی خۆکوشتن (١٧,٨ کەس) , لەفەرەنسا (١٥,٨ کەس) لەدانیمارك (٢٣,٣ کەس) ە بۆهەر (١٠٠,٠٠٠ کەس) لەم وولاتانەدا مەزهەبی پرۆتستانت بالاَ دەستە هۆی ئەمەش دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی مەزهەبی پرۆتستانت تاڕادەیەکی زیاتر ڕێگە بەئازادی تاك و فکر دەدات. هەندێکی تر هۆکارەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ بوونی حاڵەتی دانپێدانانی گوناه کردن لای کاسۆلیك کەوا لەتاك دەکات تاڕادەیەکی کەمتر هەست بەگوناه بکات. ئەوەش تێبینی دەکرێت لەنێوان برواداراندا کەمترە وەك لەبێ بروایان.

خشتەی ڕێژەی خۆکوشتن لە هەندێك وولات بۆ هەر (١٠٠,٠٠٠) هاولاتی بەپێی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی.

| | وولات | نێر | مێ | کۆی گشتی | ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | لیتوانیا | ٥٥,٩ | ٩,١ | ٣٠,٧ | ٢٠٠٨ |
| ٢ | روسیا | ٦١,٣ | ١٠,٣ | ٣٥,١ | ٢٠٠٣ |
| ٣ | کازاخستان | ٥١,٠ | ٨,٩ | ٢٩,٢ | ٢٠٠٣ |
| ٤ | ژاپۆن | ٣٥,٦ | ١٢,٨ | ٢٤ | ٢٠٠٤ |
| ٥ | کوریای باشور | ٣٢,٥ | ١٥,٠ | ٢٣,٨ | ٢٠٠٤ |
| ٦ | ئۆکرانیا | ٤٣,٠ | ٧,٣ | ٢٣,٨ | ٢٠٠٤ |
| ٧ | فنلەندا | ٣١,٧ | ٩,٤ | ٢٠,٣ | ٢٠٠٤ |
| ٨ | فەرەنسا | ٢٧,٥ | ٩,١ | ١٨,٠ | ٢٠٠٣ |
| ٩ | سویسرا | ٢٣.٧ | ١١,٣ | ١٧,٤ | ٢٠٠٤ |
| ١٠ | نۆرگوای | ٢٤,٥ | ٦,٤ | ١٥,١ | ٢٠٠١ |
| ١١ | کوبا | ٢٠,٣ | ٦,٦ | ١٣,٥ | ٢٠٠٤ |
| ١٢ | سوید | ١٩,٥ | ٧,١ | ١٣,٢ | ٢٠٠٢ |
| ١٣ | ئەڵمانیا | ١٩,٧ | ٦,٦ | ١٣,٠ | ٢٠٠٤ |
| ١٤ | کەنەدا | ١٨,٣ | ٥,٠ | ١١,٦ | ٢٠٠٢ |
| ١٥ | ئەرجەنتین | ١٤,١ | ٣,٥ | ٨,٧ | ٢٠٠٣ |



خشتەی هەندێك وولاتی عەرەب رێژەی خۆکوشتن بۆ هەر (١٠٠,٠٠٠) هاولاتی بۆ سالّی (٢٠١٦)

| | وولات | رێژە بۆ هەر ١٠٠,٠٠٠ هاولاتی |
|---|---|---|
| ١ | سودان | ١٧,٢ |
| ٢ | سومالّ | ١٦,٩ |
| ٣ | مەغریب | ٥,٣ |
| ٤ | قەتەر | ٤,٦ |
| ٥ | یەمەن | ٣,٧ |
| ٦ | ئیمارات | ٢,٣ |
| ٧ | مۆریتانیا | ٢,٩ |
| ٨ | تونس | ٢,٤ |
| ٩ | ئۆردون | ٢ |
| ١٠ | جەزائیر | ١,٩ |
| ١١ | لیبیا | ١,٨ |
| ١٢ | میسر هەروەها عێراق | ١,٧ |
| ١٣ | میرنشینی عومان | ١ |
| ١٤ | میرنشینی سعودیە | ٠,٤ |

بەپێی ئامارەکانی کوردستان رێکخراوی یەکێتی پیاوان ئاماژە بە خۆکوشتنی (٣٠٧) نێرینە دەکات لەماوەی (٥) سالّدا واتە نزیکەی سالّی (٦١) کەس، ئامارەکانی بەرێوەبەرایەتی گشتی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژی ژنان لەدوا راپۆرتی سالآنەیدا

**تایبەت بە ئامار و کاروچالاکیەکاندا ئەم داتایانە دەخاتە روو ساڵی ٢٠١٥ (٦٤) حاڵەتی خۆکوشتن، ساڵی ٢٠١٦ (٧٤) حاڵەتی خۆکوشتن.**

٤- باری خێزانی: **لەتاکی رەبەندا زیاترە وەك لەخاوەن خێزان بەدوو هێندە و لەژن و پیاوی تەلاق دراودا زیاترە وەك لەڕەبەن.**

٥-وەرزی ساڵ: **زۆربەی حاڵەتەکانی خۆکوشتن لەوەرزی بەهاردا ڕوودەدەن، لەلایەکی ترەوە نەبوونی تیشکی خۆر دەبێتە هۆی خەمۆکی و ئەگەری زیاتری خۆکوشتن بۆیە لەناوچە تاریکەکان کەزستانیان درێژە وەکو وولاتانی سکەندەنافیاو بەشێك لەئەلاسکا ڕێژەی خۆکوشتن زیاترە.**

٦-کۆمەڵایەتی و ئابووری: **لەهەندێك کۆمەڵگەدا (وەکو ژاپۆن) خۆکوشتن بەجۆرێك لەئازایەتی دادەنرێت بۆ چارەسەرکردنی هەندێك کێشە، لەکاتی هەڵکشان و داکشانی ئابووریدا ڕێژەی خۆکوشتن زۆرتر دەبێت و ئەوەی جێی سەرسورمانە سەرمایەی زۆر و خۆش گوزەرانی باڵا کاریگەری پێچەوانەی هەیە وەکو هەژاری و کەم دەرامەتی لێدێت، بەپێی هەندێك توێژینەوە ڕێژەی بەرزی خۆکوشتن لەهەندێك وولات دەگەرێننەوە بۆگەلێك هۆکار یەکێك لەوانە خۆش گوزەرانی و رەفاهییەتە کەبەهۆیەوە تاك هەست بەبەتاڵی دەکات و بێزاردەبێت لەژیانێکی ڕێکوپێك و شادمان (خۆکوشتنی بێزاری). دورکایم دەڵێ؛ هەر کاتێك یاساکانی وولات ناوەکی بوون و هاوولاتی نەیدەزانی لەئایندەدا چی ڕوودەدات ئەگەری زیان گەیاندن بەخۆ زۆر دەبێت.**

٧- باری سیاسی: سستمی وولات ئەگەر دکتاتۆریانە بێ و ستەم لەهاوولاتیان بکات وا لەتاکەکان بکات توشی بێ ئۆمێدی ببن وئاسۆی ئایندەیان لاروون نەبێت و نیشتمان بەبەندیخانەیەکی گەورە ببینن و رێی رادەربرینی ئازادیان نەداتێ بێگومان گروپ و کۆمەڵی جیاجیا پەیدا دەبن تاکەکان بەئاقارێکی تردا دەبەن و چەمکی مردن و خۆکوشتنی لا ئاسان دەکەن لەژێر کۆمەڵێك ناوی رازاوەدا پەیمانی گەورە وچەوریان دەدەنێ وبەرامبەر دۆزەخی میری بەهەشتیان بۆ ساز دەدەن چ لەم دنیا یان لەودنیا!!

٨- جۆری پیشە: هەموو جۆرە پیشەیەك برێك ترسناکی هەیە و بێکاری لەهەمووی خراپترە وتێبینی کراوە رێژەی خۆکوشتن لەنێوان خاوەن پیشە بەرزەکاندا کەبەرپرسیارێتیان گەورەترە و تایبەتمەندی کارەکەیان وادەخوازێت شێوازێکی تایبەتیان هەبێت لەژیاندا ئەگەری خۆکوشتنیان زیاترە لەخەڵکانی تر بۆ نمونە لە پزیشکانی ڤێتێرنەری و ددانددا زیاترە وەك لەپیشەکانی تر.

٩- نەخۆشییە دەرونیەکان: گومانی تێدا نییە کەپەیوەندییەکی ئاشکرا هەیە لەنێوان نەخۆشییە دەرونیەکان و خۆکوشتندا؛

▪ خەمۆکی: لە (٣٠٪ -٧٠٪) خۆکوشتنەکان پەیوەندی هەیە بەخەمۆکییەوەو سەرەتای چاکبوونەوە بەقۆناغێکی ترسناك دادەنرێت بۆیە دەبێت زۆر وریابین لەکاتی چارەسەردا زانیاری تەواو بەکەسوکاری نەخۆشەکە بڵێین.

■ سکیتزۆفرینیا: لەماوەی (١٠)ساڵی یەکەمی نەخۆشییەکەدا نزیکەی (١٠٪) یان هەوڵی خۆکوشتن دەدات و لەنێوان ئەمانیشدا (٧٥٪) رەبەنن.

■ دڵەراوکێ: بەنزیکەی (٢٠٪) ی هەوڵە سەرنەکەوتووەکانی خۆکوشتن دادەنرێت.

■ ئەو کەسانەی خاوەن کەسایەتییەکی دژە کۆمەڵن (٥٪) یان هەوڵی خۆکوشتن دەدەن.

■ ئەوانەی لەسەر مەی خواردنەوە راهاتوون (١٥٪) هەوڵی خۆکوشتن دەدەن. لە (٨٠٪) ئەمانەش نێرینەن.

ساڵانە لەوولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نزیکەی (٣٠٠,٠٠٠) کەس دەمرن بەهۆی خۆکوشتنەوە واتە هەر (٢٠) خولەك یەکێك خۆی دەکوژێت.



## بە پێی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ساڵانە نزیکەی یەك ملیۆن هاوڵاتی خۆدەکوژن.

هۆی خۆکوشتن:

١- هۆکاری کۆمەڵایەتی: **بەپێی ( دورکایم) ئەوکەسانە دەکات بەسێ کۆمەڵەوە**

❖ **خۆکوشتنی خۆویستن (ئەنانی): ئەو کەسانەن کەپەیوەندیان بەکۆمەڵەوە لاوازە و سەر بەهیچ کۆمەڵێك نین بۆیە ڕێژەی خۆکوشتن لەنێوان کەسانی ڕەبەندا زیاترە وەك لەخێزاندار و لەشاردا زیاترە وەك لەلادێ، خێزانی خاوەن منداڵ پارێزراوترە وەك لەخێزانی بێ منداڵ.**

❖ خۆکوشتنی خۆبەختکردن: **ئەو کەسانەن کەپەیوەندیان بەکۆمەڵەوە زۆر توندەو ئامادەن لەپێناوی خەڵکیدا یان لەپێناوی سەرکەوتنی بۆچونەکانیان خۆیان بەخت بکەن وەکو جەنگاوەرەکانی ژاپۆن کاتێك دژی ئەمەریکا دەجەنگان و لەمیژووی تازەشدا گروپی (حماس و جیهاد) سەر بەهەمان کۆمەڵن.**

❖ خۆکوشتنی گێرە شوێنی: **ئەو کەسانەن کەپەیوەندیان جێگیر نییە وناتوانن لەکاتی گۆڕانکارییەکاندا خۆیان بگونجێنن خێرا وورە بەردەدەن و دەشێت خۆیان بکوژن.**

٢- هۆکاری دەرونی: **بەپێی ( فرۆید) لەناخی تاکدا دوو غەریزە هەیە یەکەمیان غەریزەی بونیاد نانە پێی دەڵێن (ئیرۆس) دووەمیان**

غەریزەی لەناو بردنەو پێی دەڵێن (ساناتۆس) هەر کاتێك دووەمیان زاڵبێت بەسەر ڕەفتاری تاکدا ئەو کەسە ڕەفتاری گێرە شوێنانەی دەبێت و لەهەندێك حاڵەتدا تاك لەبری ئەوەی توندوتیژییەکەی ئاراستەی دەرەوە بکات ئاڕاستەی ناخی خۆی دەکات و زیان بەخۆی دەگەیەنێت. ئەوەی ئامازەی ووتنە فرۆید لەژیانی خۆییدا تەنها یەك حاڵەتی خۆکوشتنی وەسف کردوە.

٢- هۆکاری بایۆلۆجی:

❖ کەمی ئاستی پێنج هایدرۆکسی ئیندۆل ئەمینۆ ئەسید لەکۆی (١٦) توێژینەوە (١١) یان ئامازە بەوە دەکەن کەپەیوەندییەکی ئاشکرا هەیە لەنێوان کەمی ئاستی ئەم مادەیەو ڕەفتاری خۆکوژی.

❖ بۆماوە: خۆکوشتن لەنێوان هەندێك خێزاندا زیاترە وەك لەهەندێکی تر، هەروەها لەدووانەی یەك هێلکەدا زیاترە وەك لەدووانەی دووهێلکە بەرێژەی شەش هێندە.

## پەیوەندی نێوان جگەرەکێشان وخۆکوشتن چیە؟

بەپێی توێژینەوەیەك لە (گۆڤاری ئەمەریکی بۆ نەخۆشییە دەروونییەکان) لە (نیسانی ٢٠٠٣) دا لاپەرە (٧٧٣- ٧٧٩) دا بڵاو کراوەتەوە, لەسەر (٣٤٧) نەخۆش کراوە

(١٧٥) یان نەخۆشی خەمۆکیان هەبووە

(١٢٧) یان نەخۆشی سکیتزۆفرینیا

(٤٥) نەخۆشی تر

تێبینی کراوە کەسانی جگەرە کێش زیاتر بیری خۆکوژی وهەوڵی خۆکوشتنیان هەیە وەك لەکەسانی جگەرە نەکێش هەروەها ڕێژەی توندوتیژی لەنێوان جگەرە کێشاندا زیاترە.

ڕێگاکانی خۆکوشتن:

لەم خشتەیەدا گرنگترین ڕێگاکان نوسراوە بۆیە مەرج نیە کۆی ڕێژەی سەدی بکاتە سەدا سەد.

| شێوازی خۆکوشتن لە نێرینەدا | ڕێگاکان بەرێژەی سەدی |
|---|---|
| خنکاندن | ٪٢٨ |
| ژەهراوی بوون بەبەکارهێنانی دەرمان | ٪٢٥ |
| خۆفرێدان(هەڵدان) لەشوێنی بەرزەوە | ٪١٣ |
| ژەهراوی بوون بەمادەی یەکانە ئۆکسیدی کاربۆن | ٪٩ |
| **شێوازی خۆکوشتن لە مێینەدا** | **ڕێگاکان بە رێژەی سەدی** |
| ژەهراوی بوون بەبەکارهێنانی دەرمان | ٪٤٢ |
| خۆخنکاندن | ٪٢٢ |
| خۆفرێدان لەشوێنی بەرزەوە | ٪١٣ |
| خۆفرێدانە ناو ئاو | ٪٨ |

وەك دەبینین ئەو ڕێگایانەی کەتوندترە لەلایەن نێرینەوە زیاتر بەکاردێت. بەڵام لەکۆمەڵگەی خۆماندا مێینە زیاتر پەنادەباتە بەر خۆسوتاندن کەهۆی سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاسانی دەست

کەوتنی نەوت زۆر جار هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی کێشەی کۆمەڵایەتی. ئەوەشمان بیر نەچێت کەخۆسوتاندن مەرج نییە زۆرینەی حاڵەتەکان بێت چونکە بەکارهێنانی دەرمان ڕێژەیەکی بەرچاو پێك دێنێت بەڵام لەبەرئەوەی خۆسوتاندن ماکەکانی دەمێنێتەوەو زیاتر هاووڵاتیان ئاگاداری دەبن و دەزگاکانی ڕاگەیاندن زیاتر لەسەری دەدوێن وادێتە بەرچاو لەهەمووڕێگەکانی تر زیاتر بێت یان هەندێکجار تاکە ڕێگە بێت.!

چارەسەر:

بەپێی حاڵەتەکە دەگۆڕێت هەرلەوەی هەندێك نەخۆش پێویستی بەخەواندن هەیە لەنەخۆشخانە چارەسەری گونجاوی بۆبکرێت هەندێکی تر دەتوانرێت تەنها لەڕێگەی کلینیکەوە چارەسەری بۆبکرێت بەپێی ئەو پێنج ئاستەی کەباسمان کرد بۆ ڕەفتاری خۆکوژی بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین

١- خەواندنی لەنەخۆشخانە.

٢-بەکارهێنانی دەرمان بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشییەکەی ئەگەر نەخۆش بوو دەبێت ئەوە بزانین کەپێویستە دەرمان بەبڕێکی کەم بدەینە نەخۆش و ئاگاداری کەسوکاری نەخۆش بکەین خۆیان دەرمانەکەی بدەنێ و دەرمان لای نەخۆش دانەنرێت. هەروەها لەهەندێك حاڵەتدا وەکو سەرەتای چاك بوونەوە لەنەخۆشی

خەمۆکی کاتێکی ترسناکە بۆ هەوڵی خۆکوشتن چونکە دەشێت ئەو پلانەی نەخۆش دایناوە بۆ خۆکوشتن لەکاتی نەخۆشییەکەدا نەتوانێت جێبەجێی بکات بەهۆی کەمی تواناوە پاشان لەو کاتەدا کەبڕێك هێزی بۆ دەگەڕێتەوە هەڵدەستێت بەجێبەجێ کردنی.

٣-چاودێری کردنی نەخۆش: ئەگەر لەنەخۆشخانە بوو لەلایەن پزیشك و کارمەندانی تەندروستی و یاوەری نەخۆشەوە. پشکنینی نەخۆش و لێسەندنی هەرئامێرێك مەترسی لەسەر گیانی نەخۆش پەیدا بکات وەکو چەقۆ و دەرنەفیز و دەرمان. هتد.

ئەگەر لەماڵەوەش بوو لەلایەن کەسوکاری نەخۆشەوە، بەجێ نەهێشتنی نەخۆش بەتەنیا لەژوورێکدا و دوورخستنەوەی هەر شتێك ئەگەری بەکارهێنانی هەبێت لەلایەن نەخۆشەوە بۆخۆکوشتن وەکوچەقۆ یا هەرئامێریکی تیژی ترو گوریس و نەوت وسەرچاوەی ئاگرو دەرمان و.... هتد.

٤- رۆڵی گرنگی توێژەرەوەی کۆمەڵایەتی لەکاتی چارەسەردا ئەگەر بەهۆی کێشەی کۆمەڵایەتییەوە هەوڵی خۆکوشتن بدات. لەکۆمەڵگەی خۆماندا ئەمە رێژەیەکی بەرچاوی حاڵەتەکان پێك دێنێت.

٥-رۆڵی گرنگی چارەسازی دەرونی لەکاتی چارەسەردا، بەتایبەتی ئەگەر هۆکاری خۆکوشتنەکە بگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو نەخۆشیانەی کەدەتوانرێت لەڕێگەی چارەسازی دەرونیەوە سودی پێ بگەیەنرێت.

٦- بەکارهێنانی تەزووی کارەبا بۆ چارەسەر کردنی هەندێك حاڵەتی تایبەت لەبەکارهێنانی دەرمان باشترەو ئەنجامی خێراتری دەبێت.

دوانزه خاڵی گرنگ زەنگی خۆکوشتن لێدەدات:

**١- بوونی پلانێکی روون سەبارەت بەخۆکوشتن (بیر کردنەوە لێی یان گفتوگۆکردن) سەبارەت بەو بابەتە.**

**٢- هەستان بەو چالاکیانەی ئاماژە بەخشن بۆخۆکوژی وەکو ماڵئاوایی کردن و نوسینی وەسیەت نامە و داواکردن لەهاوڕێیەکی یان یەکێك لەئەندامانی ماڵەوە بۆ ئەوەی بیشۆن.**

**٣ – بوونی دیاردەی خۆکوژی لەو خێزانەدا یان هاوڕێیەکی بەم نزیکانە خۆی کوشتبێت.**

**٤ – بوونی کەرەسەی خۆکوشتن لەماڵدا وەکو دەمانچە و بڕێکی زۆر دەرمان.**

**٥ – ئالودەبێت لەسەر بەکارهێنانی دەرمان و مادەهۆشبەرەکان.**

**٦ – لەدەست دانی کەسوکار بەتایبەتی کەسوکاری پلەیەك , لەدەست دانی سەروەت و سامان و کاروپیشە.... هتد.**

**٧ – نەخۆش بەتەنیا بژی یان گۆشەگیر بێت.**

**٨ – خەمۆکی کەهاوەڵ بێت لەگەڵ بێ ئومێدی باوەڕنەبوون بەچاك بوونەوە.**

**٩ – بونی هەلومەسەی بیستن کەفرمانی خراپ بەنەخۆش بدات.**

**١٠ – تازە لەنەخۆشخانەی دەرونی چارەسەری بۆکرابێت و نێردرابێتە ماڵەوە.**

**١١ – دڵەراوکێ بەهەموو جۆرەکانییەوە ئەگەری خۆکوشتن زیاد دەکات.**

١٢ – هەست كردنی پزیشك بەحاڵەتی نەخۆش سەرەڕای ئەوەی نەخۆش دەیڵێت یان دەیكات ئەگەر ئەو هەستەت بۆ دروست بوو نەخۆش بەنیازی خۆكوشتنە دەبێت كاری پێویستی بۆبكەیت و لەگەڵ كەسوكاری نەخۆشدا گفتوگۆبكەیت.



پەیامەکانی مرۆڤ کەئاماژەن بەخۆکوشتن:

**دوو جۆری سەرەکیمان هەیە زارەکی و نازارەکی کەهەر یەکەیان دەکرێت بەدوو جۆری ترەوە.**

١) پەیامی ڕاستەوخۆی زارەکی:

**بەشێوەی ڕاستەوخۆ بەچواردەور دەڵێت (خۆم دەکوژم – فلان شتم بۆ نەکەن خۆم دەکوژم – لەداخی تۆ خۆم دەکوژم)**

٢)پەیامی ناڕاستەوخۆی زارەکی:

**ماوەیەك پێش هەوڵی خۆکوشتن چەند ووتەیەك دەردەبڕێت کەئاماژەن بەبێزاری و نائومێدی وەکو ( کەی ئەمە ژیانە، مردن خۆشترە لەژیان، ئەگەر جارێکی تر یەکمان بینییەوە)**

٣)پەیامی ڕاستەوخۆی نازارەکی:

**بەشێوازی کرداری ئاماژە دەدات بەچواردەوری کەبەنیازی خۆکوشتنە وەکو پەیداکردنی ( چەك، کۆکردنەوەی حەب، کڕین و پەیداکردنی مادەی ژەهراوی، ئامادەکردنی نەوت یا بەنزین.... هتد)**

٤)پەیامی ناڕاستەوخۆی نازارەکی:

**ماوەیەك پێش هەوڵی خۆکوشتن هەڵدەستێت بەرێکخستنی شتە تایبەتیەکانی خۆی وەکو شتی ناوماڵ، قەرزدانەوە یان بەخشینی شتەکانی خۆی.**

**پێشتر کەسێکی گۆشەگیربووە بەلام لەو ماوەیەدا سەردانی زۆربەی خزم و کەسوکار و هاوڕێکانی دەکات، وەکو خواحافیزی کردنێك لێیان.**

هەندێك پرسیاری گرنگ لەبارەی ئایین و خۆکوژی

یەکەم: هەلوێستی ئیسلام لەبارەی خۆ کوشتنەوە چیە؟

**لە قورئاندا بەروونی دەفەرموێت خۆتان مەکوژن پەروەردگار بەخشندەیە بەرانبەرتان.** ﴿ولا تقتلوا أنفسكم إن الله كان بكم رحيمًا﴾ (النساء: ٢٩).

عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: " من تردى من جبل فقتل فسه فهو في نار جهنم يتردى فيه خالداً مخلداً فيها أبداً، ومَن تحسّى سمّاً فقتل نفسه فسمُّه في يده يتحساه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً، ومَن قتل نفسه بحديدة فحديدته في يده يجأ بها في بطنه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً " (البخاري ومسلم)

**هەر کەسێك لە چیا خۆی بخاتە خوارەوە خۆی بکوژێت لە ئاگری دۆزەخ دەمێنێتەوە بۆ هەتا هەتایە، هەر کەسێك ژەهر بخواتەوە خۆی بکوژێت ژەهرەکەی لە دەستدایە دەیخواتەوە لە ئاگری دۆزەخ بۆ هەتا هەتایە، هەر کەسێك بە ئاسن خۆی بکوژێت ئاسنەکەی لە دەستدایە دەیکات بە سکیدا لە ئاگری دۆزەخ بۆ هەتا هەتایە.**

وعن ثابت بن الضحاك رضي الله عنه أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: " من قتل نفسه بشيء في الدنيا عذب به يوم القيامة" (البخاري ومسلم)

**هەر کەسێك لە دونیا بە جی خۆی بکوژێت لە قیامەتدا بەو شتە ئازاردەدرێت.**

" وعن جندب بن عبد الله رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: كان فيمن قبلكم رجل به جرح فجزع فأخذ سكيناً فحز بها يده فما رقأ الدم حتى مات. قال الله تعالى: بادرني عبدي بنفسه حرمت عليه الجنة " (البخاري ومسلم)

**لە پێش ئێوەدا پیاوێك برینێکی هەبوو نارەحەتی دەکرد چەقۆیەکی هێنا دەستی بریندارکرد تا هێندە خوێنی لێرۆیی مرد خوای بالادەست فەرمووی بەندەم خۆی پێشخست بەهەشتم لەسەرحەرام کرد.**

" فعن جابر بن سمرة رضي الله عنه قال: أتي النبي صلى الله عليه وسلم برجل قتل نفسه بمشاقص فلم يصل عليه" (مسلم)

**کەسێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ خۆی بە رم کوشتبوو نوێژی لەسەر نەکرد.**

**پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ خۆی نوێژی لەسەر نەکردووە بەلام رێگری نەکردووە کە هاوەڵان نوێژی لەسەربکەن. دەتوانرێت نوێژی لەسەر بکرێت بەپێی مەزهەبی شافعی و مالکی و حەنەفی بۆچوونی زوربەی زانایان.**

دووەم: ئایا خۆکوژ کافر ەبێت؟

**کاتێك پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ کۆچ دەکات بۆ مەدینە طفیل و هاورێیەکی کۆچ دەکەن بۆ لای، لەرێگا ئەو هاوەڵەی زۆر ماندوو**

دەبێت و خۆی بریندار دەکات تا دەمرێت، کاتێك دێتە خەوی طفیل دەبینێت هەموو جەستەی جوانە بەڵام دەستی داپۆشراوە، پێی دەڵێت: ئەوە بۆ بەو جۆرەیت؟ پێی دەڵێت: بەهۆی کۆچکردنم بۆ لای پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ خوای بەخشندە لێم خۆشبوو بەڵام لە دەستم خۆش نەبوو، کاتێك طفیل هاتە مەدینە ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ گێرایەوە پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ فەرمووی: خوایە لە دەستیشی خۆش بە.

ئەمەش بەڵگەیە کە خۆکوژ کافر نابێت دەتوانرێت دوعای خێری بۆ بکرێت.

هاجر النبي صلى الله عليه وسلم إلى المدينة هاجر إليه الطفيل بن عمرو وهاجر معه رجل من قومه، فاجتووا المدينة، فمرض فجزع، فأخذ مشاقص له فقطع بها براجمه، فشخبت يداه حتى مات، فرآه الطفيل بن عمرو في منامه، فرآه وهيئته حسنة ورآه مغطياً يديه، فقال له: ما صنع بك ربك؟ فقال: "غفر لي بهجرتي إلى نبيه صلى الله عليه وسلم"، فقال: مالي أراك مغطياً يديك؟ قال: "قيل لي: لن نصلح منك ما أفسدت".

فقصها الطفيل على رسول الله صلى الله عليه وسلم؛ فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: "اللهم وليديه فاغفر"، وقد ترجم الإمام مسلم على هذا الحديث بقوله: (باب الدليل على أن قاتل نفسه لا يكفر).

سێیەم: ئایا نوێژی مردووی لەسەر دەکرێت؟

ئەوەی خۆی دەکوژێت وەکو مردووی ئاسایی دەشۆردرێت و کفن و دفنی بۆ دەکرن و نوێژی لەسەر دەکرێت و لە گۆرستانی موسولمانان دەنێژرێت و میراتگری بۆ دەکرێت، بە خۆکوشتن تاك كافر نابێت و لە رەحمی خوا بێبەش نابێت و دەتوانرێت دوعای خێری بۆ بکرێت، چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت کەسی لە رەحم و بەزەیی خوا بێبەش بکات و کەس نازانێت ئەو کاتەی تاك ئەم کارە دەکات لە چ بارێکی دەرونی و هۆشمەندیدایە، بۆیە کەس ناتوانێت ئەو کەسە کافر بکات یان تەنانەت گوناهباری بکات و ئەو فەرمودانەی هەن، ناکرێت گشتگیر بکرێت بۆ هەموو خۆکوژێك پەیرەو بکرێت، دەشێت هەندێك کەس بە خۆکوشتن گوناهبار ببن و لە دۆزەخدا بمێننەوە و هەندێکی تر گوناهبار نەبن، هەمیشە بیرمان بێت خوای بەخشندە بە بەزەییە بەرانبەر بە مرۆڤەکان.

خوای بەخشندە لەهەموو گوناهێك خۆش دەبێت تەنها هاوەڵ پەیداکردن نەبێت، ﴿إن الله لا يغفر أن يشرك به ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء﴾. دیارە خۆکوژ هاوەڵی بۆ خوا پەیدا نەکردووە.

مەرج نیە بۆ هەتا هەتایە لەدۆزەخ بێت چونکە هەر کەسێك لە دڵیەوە بڵێت هیچ خوایەك نیە جگە لە خوا لە دۆزەخ دێتە دەرەوە "يخرج من النار من قال: لا إله إلا الله خالصا من قلبه".

بەرنامەی ئیسلام چیە بۆ رێگرتن لە خۆکوشتن؟

**سەرجەم ئایینەکان خۆکوشتنیان بەکارێکی خراپ ناوبردووە و سەرجەم پەیامەکانی مرۆڤایەتی دژی ئەومیە تاك خۆی بکوژێت چونکە گرفت و نارەحەتیەکانی تاك هەر چیەك بێت هەمیشە ڕێگاچارەیەك هەیە کەلە خۆکوشتن باشتر بێت.**

**خۆکوشتن حاڵەتێکی تازە نیە و بەدرێژایی مێژوو و لەسەرجەم کۆمەڵگەکاندا هەبووە و تا ئێستاش بەردەوامی هەیە و بەشێکی زۆری خۆکوژیەکانی پەیوەندی بە لایەنی دەرونیەوە هەیە یان تاك پێش خۆکوشتن بەبارێکی دەرونی نائارامدا تێدەپەرێت، بێگومان هۆکاری تریش هەیە.**

**ئەو ڕێنمایی و چارەسەرانەی بۆ هەردوو حاڵەتی خەمۆکی و دڵەراوکی باسکراون هەر هەموویان بەسوودن بۆ حاڵەتی خۆکوژی بەو پێیەی بەشێکی زۆری ئەوانەی هەوڵی خوکوشتن دەدەن دەشێت حاڵەتی خەمۆکی یان دڵەراوکێیان هەبێت.﴿ بۆیە پێویست بە دووبارە کردنەومیان ناکات).**

**دەشێت هەندێك حاڵەتی خەمۆکی لەگەڵیدا زوهان ﴿ سایکۆسس) دا ڕوبدات لەم بارەدا ڕێگری کردن کارێکی ئاسان نیە و بەپێ بەڵگە زانستی و شەرعیەکان تاك گوناهبار نابێ و بەرپرس نیە لەرەفتارەکانی چونکە لایەنی هۆشمەندی تاك سەقامگیری لەدەست دەدات و مەترسی رەفتارەکانی خۆی نازانێت لەزۆربەی کاتەکاندا.**

رفع القلم عن ثلاثة، عن الصبي حتى يبلغ، وعن النائم حتى يستيقظ، وعن المجنون حتى يفيق) (ابوداو والنسائي) واتە پێنوس لەسەر سێ کەس هەلگیراوە، مندالٚ هەتا پێدەگات، نوستوو تا خەبەری دەبێتەوە، تێکچوو تا چاکدەبێتەوە).



## پەشێوی فشاری کورت خایەن

**بەپێی کتێبەکانی دەستنیشانکردنی نەخۆشییە دەروونیەکان (٣٠ ٪) ئەوانەی سەردانی پزیشکی دەروونی دەکەن سەرەڕای نیشانەی جەستەیی و دەروونی فشار هیچ نەخۆشییەکی دەروونیان نیە و زۆر زیاتر لەم ڕێژەیەش لەو نەخۆشانەدایە کەسەردانی پزیشکی هەناوی دەکەن.**

**بێگومان گەلێك فشار هەن لەژیانی تاکدا توشی شەکەتی و ماندوو بوونی دەکەن ئەو فشارانەی ئاشکران و کورت خایەنن تاك دەیانناسێتەوە تارادەیەك دەزانێت چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکات بەڵام فشارە درێژخایەنەکان بەئاسانی دەرکیان پێناکرێت و هێدی هێدی تواناکانی تاك لەناودەبەن و توشی گەلێك نەخۆشی و نەهامەتی دەکەن. گرنگترینی ئەو فشارانەش بریتین لە:**

١- فشاری کار و پیشە:

**زۆرێك لەپیشەوەران و فەرمانبەران کارەکەیان بەدڵ نیە، ناچاری وایلێدەکات ئەو کارە بکەن، نەگونجان لەگەڵ هاوەڵانی کار و کەمی داهات و زۆری ماوەی کارکردن و پێنەزانینی ماندوو بونت لەلایەن کەسانی ترەوە هەمووی بەجۆرێك لەجۆرەکانی فشار دادەنرێت.**

٢- فشاری خێزانی:

- جیاوازی تەمەن: **جیاوازی تەمەنی هاوژینەکان کاریگەری ئاشکرای هەیە لەسەر بوونی فشار چونکە ئەو جیاوازیە وادەکات**

هەردوو تاك نەتوانن بەپێی پێویست چێژ لەحەزو ئارەزووەکانیان وەرگرن، دەشێت بۆ ماوەیەکی کاتی یەکێکیان ئامادەبێت واز لەحەز و خولیاکانی خۆی بهێنێت بەلآم پاش ماوەیەك گرفت و کێشەکان سەرهەڵدەدەن، ڕەنگە هەندێك نمونەی کەم هەبێت کەدوو هاوسەر سەرکەوتوو بوبێتن سەرەڕای جیاوازی تەمەن بەلآم هیچ کات بوونی حاڵەتێك یان چەند حاڵەتێك ناتوانێت ئەو ڕاستیە زانستیە بگۆڕێت کەمرۆڤ ناتوانێت بەردەوام بۆ بەرامبەرەکەی بژی.

● ئاستی رۆشنبیری: **جیاوازی ئاستی رۆشنبیری کاریگەری روون و راستەوخۆی هەیە لەسەر دروستکردنی فشار بەهۆی دروستبوونی جیاوازی و لێکتێنەیگشتن لەپەروەردەی منداڵو چالاکی کۆمەلآیەتی زۆر بواری چالاکی رۆژانە.**

● خولیاکان: **جیاوازی حەزو خولیاکانی هاوسەر کاریگەری دەبێت لەسەر تاکی بەرانبەر و فشاری بۆ دروست دەکات.**

● خراپی باری دارایی: **کێشەو خراپی باری دارایی بەجۆرێکی کاریگەری فشار دادەنرێت چونکە بەم هۆیەوە فشار لەسەر هەندێك بواری تری ژیان دروست دەبێت.**

● کێشەی بەردەوام و ئاژاوە.

٣- فشاری کۆمەلآیەتی: **هەندێك چالاکی کۆمەلآیەتی پێویستی بەکات و پارەی زۆر هەیە کەلەتوانای هە موو کەس نیە.**

٤- لەدەستدان: **لەدەستدانی کەسێکی نزیك، لەدەستدانی کار و پیشە، زیان لێکەوتنی دارایی یان جەستەیی، شەرو پێکدادان و ڕوداوە سروشتیەکانی وەکو لافاو و بومەلەرزە وبورکان.**

**٥- جەستەیی: بوونی نەخۆشی درێژخایەن یان نەخۆشییەك کەچارەسەری ئاسان نەبێت یان پارەی زۆری بوێت یان چارەسەری نەبێت یان جێی شەرم بێت(وەکو ئەو نەخوشیانەی لەرێی پەیوەندی سێکسەوە دەگوێزرێتەوە یان ئەو نەخۆشیانەی هەندێك ناوچەی هەستیاری جەستە توشی دەبێت رووخسار یان هەندێك ناوچەی کۆئەندامی هەرس)**

**٦- فشارە ناوخۆییەکان: جیاوازی زۆر لەنێوان خودی ڕاستەقینەو خودی خوازراو و رێگری کۆمەلایەتی و ئابوری و ئایینی بۆ بەدەستهێنانی.**

**فشار بەڕادەیەکی کەم پێویستە بۆ هاندانی هەستی بەرپرسیارێتی و داهێنان بەلام هەر کاتێك لەسەرو تواناکانی تاکەوە بوو دەبێتە فاکتەری داهێزران و لەناوبردن.**

نیشانەکان:

**کۆمەلێك نیشانەی جەستەیی و دەرونی و ڕەفتاری هەن کەناوبەناو لەتاکدا دەردەکەون و بێزاری دەکەن و کاریگەریان دەبێت لەسەر توانای کۆمەلایەتی و پیشەیی تاك.**

١- نیشانە دەرونیەکان:

- **دلەڕاوکێ.**
- **تورەبون.**
- **خەوی ناخۆش.**
- **شپرزەیی.**

- گرفت لەبڕیاردان (ڕاڕایی).
- کەمی تەرکیز و بیرچونەوە.
- نەمانی باوەڕ بەخود.
- خۆبەکەم زانین.
- بڕیاردانی بەپەلە بەبێ لێکۆلینەوە لێی.

٢- نیشانە جەستەییەکان:

- دڵتێکەڵهاتن.
- سەرئێشە.
- خێراڵێدانی دڵ.
- هەناسە تەنگی.
- ئازاری سنگ.
- بەرزی فشاری خوێن.
- لەرزین.
- زۆر عەرەقکردنەوە.
- گرژبوون لەماسولکەکان.
- سکچون یان قەبزی.

٣- نیشانە ڕەفتاریەکان:

- توڕەبوون.
- پەنابردنە بەجگەرەکێشان.
- زۆر بەکارهێنانی چاو قاوە.
- بەکارهێنانی ئەلکحول.
- بەکارهێنانی مادەهێورکەرەوەکان.

بێگومـان ئەگەرفشـارەكان بـەردەوام بـن و تـاك پـەنا نەباتـە بـەر چارەسەر هەندێك نەخۆشی جەستەیی و دەرونی لەتاكدا بەدەردەكەون گرنگترینیان:

- بڕینی گەدە و دوانزە گرێ.
- بەرزی فشاری خوێن.
- شەكرە.
- لاوازی جنسی.
- تێكچونی سوڕی مانگانە.
- لاوازی سستمی بەرگری.
- زوو پیربوون بەهۆی پوكانەوەی هەندێك بەشی مێشك.
- زوو چرچ بوونی پێست.
- لاوازی چالاكی جەستەیی و هۆشەنگی.
- تاك لەسەرو تەمەنی خۆیەوە بەدەردەكەوێت.
- دڵەڕاوكێی گشتی.
- خەمۆكی.

چارەسەر:

زیاتر لەرێگەیەك هەیە بۆ چارەسـەری فشاری دەرونـی، بەداخـەوە گـەلێك لەئێمـە بەهیچیان ئاشـنا نـین یـان گرنگـی و نرخیـان نـازانین. لێرەدا تەنها هەنـدێك لەو رێگە چارە و رێنماییانە باس دەكـەین كـەتاك دەتوانێت سودمەند بێت لێیان و بواری پراكتیزەكردنی هەیە.

١ چارەسەرکردنی نیشانەکان: **لەرێگەی بەکارهێنانی دەرمان لەژێر چاودێری پزیشکدا چونکە زۆربەی دەرمانەکانی دژی دڵەراوکێ ئەگەری ئالودەبونیان هەیە بۆیە واباشە دەرمانی دژەخەمۆکی بەبرێکی کەم بەکاربهێنرێت. چارەسەری هزری و رەفتاری بۆ زاڵبون بەسەر هەندێك لەنیشانەکان و تورەبوندا.**

٢- دانانی پلانێك بۆ بەرەنگاربونەوەی فشار.

✓ **گۆرینی شێوازی بیرکردنەوە لەنەگەتیڤەوە بۆ پۆزەتیف وەك دەزانین ئەوانەی بەنەرێنی دەروانە شتەکان زیاتر توشی فشار دەبن وەك لەوانەی بەئەرێنی دەروانن، ئاسانترین نمونەی ئەمەش تێروانینە بۆ پەرداخێك کەنیوەی ئاو بێت کەسی نەرێنی دەڵێت نیوەی بەتاڵەو خەفەت دەخوات بەڵام ئەرێنی دەڵێت نیوەی ئاوەو شادمانە.**

✓ **کاتێك هەندێك ئەرك دەزانیت لەسەروتوانای خۆتەوەیە مەچۆرە ژێر فشاری کەسانی تر و رووگیر مەبە لەوەی داوای لێبوردن بکەی کەناتوانیت ئەم کارە بکەی بەڵکو بریار بەو لەسەرو توانای خۆتەوە کار مەگرە ئەستۆ.**

✓ **لەکاتی بونی کێشەیەکدا هەوڵبدە لەگەڵ کەسە نزیك و باوەر پێکراوەکانتدا باسی بکەیت ئەگەر کەس نەبوو دەتوانیت بەرامبەر ئاوێنە دانیشیت و بۆ خۆت بدوێیت یان بەرامبەر پەیکەرێك یان پەرمیەك بێنەو ئەوەی هەستی پێدەکەیت بینوسە، دڵنیابە بەو شێوازانە برێك هێمن دەبیتەوە و فشارەکەت روو لەکەمی دەکات.**

✓ خۆ ڕاهێنان لەسەر هونەری چارەسەری فشار و کێشە بەوەی پێنوس و پەڕە(کاغەز) بێنیت و پێناسەی کێشەکەت بنوسە، هۆکاری کێشەکە، ڕێگە چارەکانی کەلەتوانادایە، سودو مەترسی هەر ڕێگەیەك پاشان لەگەڵ هاورێیەك یان زیاتر گفتوگۆ بکە سەبارەت بەو شتانە تاکو بزانیت کام ڕێگەیان باشترینە.

✓ ڕێکخستنی کارەکان و شمەکەکان بڕێکی زۆر کاتت بۆ دەگەڕێتەوە و فشارت کەمتر دەبێت لەچاو ئەو کەسانەی کاتێکی زۆر دەکوژن بەگەڕان بەدوای فایلێکدا.

✓ با هیواکانت سنورداربن و خەیاڵی نەبن و ئەگەری جێبەجێ کردنیان هەبێت.

✓ خشتەی دروست دابنێ بۆ کارەکانت لەگرنگەوە بۆ کەمتر گرنگ و پاشان بۆ کارە سادەکان.

✓ گۆڕینی شێوازی ژیان:

○ پەیرەوی کردنی سستمێکی خواردنی دروست کەهاوسەنگی خۆراکی ڕاگرێت.

○ وەرزشکردن بەشێوەیەکی دروست ئەو وەرزشەی لەگەڵ تەمەن و تواناتدا دەگونجێت.

○ شێلان بەتایبەتی شان و مل. (بەڵام بە ئاراستەی ماسولکەکان و بەشێوازی زانستی دروست).

○ وەرگرتنی حەمامی گەرم چونکە دەبێتە هۆی خاوبونەوە بەتایبەتی ئەو حەمامانەی کەئاوگرەی (بانو)ی هەیە.

○ چێژوەرگرتن لەچالاکی تر نوێژکردن، مۆسیقا، خوێندنەوە.

○ وەرگرتنی بری پێویست لەنوستن بەپێی تەمەن کەنزیکەی (٧-٨) کاژێرە.

○ راهاتن لەسەر هونەری خۆخاوکردنەوە کەگرنگیەکی گەورەی هەیە لەکەمکردنەوەی فشار. لەرێگەی هەناسەی قوڵەوە یان جەلسەی خەیاڵ بەوەی زینگەیەکی ئارام و خۆش بۆ خۆت بسازێنیت بۆ چەند کاژێرێك یان چەند خولەکێك رۆژانە لەو کەشەدا بژیت کەس ناتوانێت سنوری خەونەکانت دیاری بکات و هیچ رێگرێکی ئابوری و کۆمەڵایەتی نیە بۆ ئەو حاڵەتە.

○ وەرگرتنی مۆڵەت مانگانە یان کۆکردنەوەی رۆژەکانی مۆڵەت لەکۆتایی ساڵدا و گەشتکردن یان بەسەربردنی کات دوور لەجەنجاڵی کار.

○ بیرت نەچێت گەشبینی سەرەتای رەوینەوەی هەموو فشارەکانە.

سەبارەت بە بڕواداران:

● بڕوادار دوورترین کەسە لە فشارەوە چونکە خوای بەخشندە چارەسەرێکی بەهێزی پێبەخشیوە ئەویش ئارامگرتنە، ﴿وإِن تصبِرُوا وتتقُوا فإِنَّ ذلك مِنْ عزْمِ الأُمُورِ﴾ (آل عمران: ١٨٦). ئەگەر خۆراگر بن و پارێزکاربن و لەخوا بترسن (لەسنور دەرنەچن)، ئەوە بەراستی ئەو هەڵوێستە لە کارە پەسەند و کردەوە پایەدارەکانە.

بێباوەر وا دەروانێتە دونیا کە کۆتایی هەموو شتەکانە و ژیانی پاش مردن نیە ئەمەش ئازارەکانی زیاتر دەکات و فشارەکانی چەند هێندە دەبنەوە چونکە چارەسەرێك بۆ کێشەو خەمەکانی بەدی ناکات.

بەڵام تاكی بروادار ئارامگرە لە بەر رەزامەندی خوا و لە رێی ئارامگرتنەوە بە هێمنی و لەسەرخۆ چارەسەری فشارەكانی دەكات، لە توندترین و ناخۆشترین فشاردا بە قەزای خوای بەخشندە رازیەو شادمانە هەر لەبەر ئەومیە پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەفەرموێت (عجبت لحال المؤمن... إذا أصابته ضراء صبر فكان خيراً له، وإن أصابته سراء شكر فكان خيراً له). ( سەرم سورماوە لە حاڵی بروادار، ئەگەر ناخۆشی بەسەردا بێت ئارام دەگرێت بەمەش خێری دەست دەكەوێت، وە ئەگەر خۆشی توشبێت سوپاسگوزارە خێری دەست دەكەوێت.

﴿واصبِرُوا إنَّ اللهَ مَعَ الصَّابرِينَ﴾ (الأنفال: ٤٦). ئارامبگرن خوا لەگەڵ ئارامگراندایە ئایا لەوە جوانتر و خۆشتر هەیە خوات لەگەڵدا بێت ئایا ئەمە خۆی لە خۆیدا بەس نیە بۆ ئەوەی چارەسەری فشاربكات هەر جۆرە فشارێك بێت.

- ﴿والَّذِينَ صَبَرُوا ابتِغاءَ وَجهِ رَبِّهِمْ وأقَامُوا الصَّلاةَ وأنفَقُوا مِمَّا رَزَقنَاهُمْ سِرًّا وَعلانِيَةً ويَدرَءُونَ بالحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ أولئِكَ لَهُمْ عُقبَى الدَّار ★ جَنَّاتُ عَدنٍ يَدخُلُونَها وَمَنْ صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وأزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ والمَلائِكَةُ يَدخُلُونَ عَلَيهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ ★ سَلامٌ عَلَيكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقبَى الدَّارِ﴾ (الرعد: ٢٢-٢٤).

ئەوانەش كە دانیان بە خۆداگرت و بەئارام بوون بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی پەروەردگاریان و نوێژەكەشیان بە چاكی ئەنجام داوە و لەو رزق و رۆزیەی پێمان بەخشیوون بەخشیویانە، بە

نهێنی و ئاشکرا و بە چاکەکاری و شێوازی جوان پاڵبە نادروستی و هەڵـە و خراپەکاریــەوە دەنــێن، ئـا ئەوانــە ســەرەنجامەکەیان ئــەو خانووبـەرە ( رازاوەیەیـە لـە بەهەشـتدا. کـە باخـەکانی بەهەشـتی - عەدنە- بۆیان رازاوەتەوە، بەشادیەوە دەچنە ناوی، هاوڕێ لەگەڵ هەر کەسـێك چـاك و پـاك و خواناسـە لـەباوو بـاپیران و هاوسـەرانیان و نــەوەکانیان، جــا فریشــتەکان دەچــن بــۆ ســەردانیان لەهــەموو دەروازەکانــەوە. دەلـێن سـڵاوتان لێبێـت بـەهۆی خۆگرتنتانـەوە (لـە کێشەکانی ژیان، لـە بەرابـەر گاڵتـەجاریی خوانەناسـان) کـەوابوو ئـای چەنـدە جێگە و ڕێگەیەکی خۆشتان بۆ خۆتان مسۆگەرکرد.

• هەندێك کات بەهۆی گرفتی داراییەوە تاك هەست بە فشار و بێزاری دەکات و بێئومێدی روویتێدەکات بۆیـە قورئـان پێمـان دەفەرموێت نەوەکانتان لەبەر ترسی برسی مەکوژن پـەروەردگار رۆزی ئێـوە و ئـەوانیش دەدات.﴿ولا تقتلـوا أولادكـم مـن إمـلاق نحن نرزقكم وإياهم﴾ (الأنعام١٥١)

• هەندێك کات بەهۆی گرفتـی دەرونیـەوە مـرۆڤ هەسـت بـە نائومێـدی و نارەحــەتی دەکــات بۆیــە ئیســلام داوای لێــدەکات خــاوەن دەرونێکــی ئــارام و هــێمن بێــت. ﴿یـا أيتهـا الـنفس المطمئنة* ارجعي إلى ربك راضية مرضية﴾ (الفجر٢٧.٢٨)

• تـرس لـەمردن یەکێکـە لـە فشـارەکانی ژیـان کـە قورئـان پێناسەی ژیـان و مـردنمـان بـۆ دەکـات بـە بـروادار دەڵێـت ئـەوەی

مـردن و ژيـانی بـەديهێناوە بـۆ ئـەوەی تاقيتـان بكاتـەوە كـە كـردەوەی كامتـان باشـترە وەهـەر ئـەو بـالاّ دەسـت و لێخۆشـبووە. ﴿الـذي خلـق المـوت والحيـاة ليبلـوكم أيكـم أحسـن عمـلا وهـو العزيـز الغفور﴾ (الملك٢)، بۆيە تاكی بـراوادار دڵنيايـە لـەوەی دوای مـردن ژيانێكی تر هەيە كە پاداشتی كارە چاكەكانی وەردەگرێت و هـەر سـتەمێك لـەم دونيـادا بەرانبـەری بكرێـت ئەگـەر دادگاكـانی سەرزەوی نەتوانن دادگـەری بكـەن و مـاف وەربگرنـەوە ئـەوە لای خوا مافەكانی پارێزراوە و وەردەگيرێتەوە.

• زۆرجار كاتێك مرۆڤ هەڵەيەك يان گوناهێك دەكات هەست بـە نارەحـەتی و بێـزاری دەكـات و دەسـتدەكات بـە لۆمـەكردنی خـود، هەنـدێك كـات دەگاتـە ئاسـتی دڵەراوكێ و خـەمۆكی بۆيـە پەروردگار لە پەرتوكە پيرۆزەكەيدا دەفەرموێت ئـەی بەنـدەكانم ئەی ئەوانەی كە خۆتان زۆر گوناهبار كردووە نائومێد مەبن لـە ميهرەبـانی و بـەزەيی خـوا چـونكە بێگومـان خـوا لەهـەموو گوناهـەكانتان خـۆش دەبێـت بەراسـتی هـەر ئـەوە لێبـوردەی بەبەزەييە. ﴿قل يا عبادي الذين أسرفوا على أنفسهم لا تقنطوا مـن رحمـة اللـه إن اللـه يغفـر الـذنوب جميعـا إنـه هـو الغفـور الـرحيم﴾ (الزمر٥٣)

• ئەوانەی كە كاتێك كردەوەيـەكی ناشـرين دەكـەن يـا سـتەم لە خۆيان دەكەن كە يادی خوايان كـردووە ئينجا داوای لێبـوردن

دەكەن بۆ گوناهەكانیان كێ دەبورێت لە گوناهەكان جگە لە خـوا
﴿والـذين إذا فعلـوا فاحشـةً أو ظلمـوا أنفسـهم ذكـروا اللـه فاسـتغفروا لذنوبهم ومن يغفر الذنوب إلا الله﴾ (آل عمران١٣٥)

• دەشـێت تـاك بـەهۆی كەڵەكـەبوونی گرفتـەكانی ژیـان و خراپی باری دارایی و ماندوو بوونی جەستە و مێشكی دونیای لا تەسك بێتەوەو وا گومان بـەرێت هـەموو دەروازەكـان داخـراون و توشـی نائومێدی ببێت بۆیـە خـوای بەخشـندە لـە قورئانـدا بـۆ ئەوانـەی كـە دەگەنـە ئـەو حاڵەتـە پـڕ ناسـۆری و نائومێدیـە دەفەرموێت هەر كەسێ خواناس بێت (بەتەقوا بێت) خوا دەروی لێدەكاتەوە، وە رزق و رۆزی دەدات لەلایەكەوە كە بەخەیاڵیـدا نەهاتووە وەهەر كەسێ پشت بەخوا ببەستێت ئەوە خوای بەسە.
﴿ومن يتق الله يجعل له مخرجا ★ ويرزقه من حيث لا يحتسب ومن يتوكل على الله فهو حسبه﴾ (الطلاق ٢-٣)

• مردن (لەدەستدان) لـەرووی زانسـتیەوە یەكێكە لـە فشارە گـەورەكانی ژیـان بۆیــە لــە قورئانــدا دەفــەرموێت مــژدە بــدە بەوانەی ئارامگرن كاتێك كەبەڵایەكیان بەسـەردێت دەڵـێن ئێمـە هەر هی خواین و هەر بۆلای ئەو دەگەرێینەوە ئـا ئەوانـە درووود و بەزەیی بەسەریاندا دەبارێـت لەلایـەن پـەروەردگارەوە. ﴿وبشر الصابرين الذين إذا أصابتهم مصيبة قالوا إنا لله وإنا إليه راجعون ★ أولئك عليهم صلوات من ربهم ورحمة وأولئك هم المهتدون﴾، (البقـرة: ١٥٥ — ١٥٧)

# بەشی حەوتەم:

کاریگەری دەرونی پەرزشتەکان

نوێژ و کاریگەری دەروونی

ڕۆژوو و کاریگەری دەروونی

زەکات و کاریگەری دەروونی

حەجکردن و کاریگەری دەروونی

کاریگەری پەرزشتەکان لەسەر لایەنی دەروونی

# کاریگەری پەرزشتەکان لەسەر لایەنی دەروونی

گومانی تێدا نیە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا کۆمەڵێك پایە هەیە کە زۆر گرنگن ئەویش پەرزشتەکانە و هەر یەکەیان گرنگی خۆی هەیە لە ژیانی تاکدا لەهەموو رووەکانەوە، بەڵام بابەتی سەرەکی ئێمە لایەنی دەروونیە بۆیە تەنها باس لەو لایەنە دەکەین.

نوێژو کاریگەری دەروونی

دیارە یەکێك لە پێویستیەکانی نوێژ بریتیە لە دەست نوێژگرتن بۆیە گرنگە باس لە گرنگی دەست نوێژ بکەین.

ئاشکرایە پەیامی یەکەمی دەستنوێژ خۆپاکراگرتنە و بۆ ئەوەی بەپاکی بچێتە ناونوێژەوە و لەبەردەم زاتی خوای بالادەستدا بەشێوەیەکی پاکوخاوێن بێت، بۆیە لە زیاتر لە ئایەتێکی قورئاندا باس لە گرنگی خۆپاکراگرتن دەکات.

- ﴿ وينزل عليكم من السماء ماءاً ليطهركم به ويذهب عنكم رجز الشيطان﴾ (الأنفال: ١١).

بارانیشی لە ئاسمانەوە بۆ باراندن تا پاکتان بکاتەوە پیسی شەیتان لە ئێوە دوور بخاتەوە.

- ﴿ وثيابك فطهر﴾ (المدثر: ٤)

پۆشاکەکانت پاکراگرە.

- ﴿فيه رجال يحبون أن يتطهروا والله يحب المطهرين﴾ (التوبة: ١٠٨)

پیاوانێکی تیایە پێیان خۆشە پاکوخاوێنبن و خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە پاکوخاوێنن.

- ﴿ إن الله يحب التوابين ويحب المتطهرين﴾ (البقرة: ٢٢٢).
- پەروەردگار تۆبەکاران و پاکژکارانی خۆش دەوێت.
- ﴿ يا أيها الذين ءامنوا لا تقربوا الصلاة وأنتم سكارى حتى تعلموا ما تقولون ولا جنباً إلا عابري سبيل حتى تغتسلوا وإن كنتم مرضى أو على سفر أو جاء أحد منكم من الغائط أو لامستم النساء فلم تجدوا ماءاً فتيمموا صعيداً طيبا فامسحوا بوجوهكم وأيديكم إن الله كان غفوراً رحيما﴾ (النساء: ٤٣).

ئەی کەسانێك کەباوەرتان هێناوە، نزیکی نوێژ مەبنەوە کاتێك سەرخۆشن، هەتا بزانن چی دەلێن، هەروەها نزیکی (جێگای) نوێژ مەبنەوە کاتێك لەشتان گرانە، مەگەر تێپەربن (بەمزگەوتدا) هەتا خۆتان دەشۆن، ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون یان کەسێك لە ئێوە هاتەوە لە شوێنی دەست بەئاوگەیاندن یان جووت بوون لەگەڵ خێزانەکانتان، ئاوتان دەست نەکەوت بەخۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن، بەو خۆڵە روخسار و دەستەکانتان تەیەموم بکەن، بەراستی خوا هەمیشە سرمرەوی گوناە و تاوانەکانە.

- پێغەمبەری ئازیز دەفەرموێت کاتێك بەندە دەستنوێژ دەگریت، بەشتنی دەستی گونەهاکانی لەدەستی دێنە دەرێ، بەشتنی روخساری گونەهەکانی لە روخساری دێنە دەرێ، بەشتنی پەلەکانی و مەسحکردنی سەری گوناهەکانی لە پەلکان و سەری دێنە دەرێ، بەشتنی پێکانی گوناهەکانی لەپێکانیەوە دێنە دەرێ.

"إن العبد إذا توضأ فغسل يديه، خرت خطاياه من يديه، فإذا غسل وجهه، خرت خطاياه من وجهه، فإذا غسل ذراعيه ومسح برأسه، خرت خطاياه من ذراعيه ورأسه، فإذا غسل رجليه خرت خطاياه من رجليه " رواه بن ماجة.

**بێگومان دەستنوێژ گەلێك سوودی جەستەیی و دەرونی هەیە لێرەدا تەنها باس لە سوودە دەرونیەکانی دەکەین:**

**١- کەمکردنەوەی دڵەراوکێ و شلەژان.**

**٢-کەمکردنەوەی تورەیی و زیان گەیاندن و بۆیە پێغەمبەری خۆشەویست ﴿د.خ﴾ ئامۆژگاریمان دەکات لەکاتی تورەییدا دەست نوێژ بگرین** " فإذا غضب أحدكم فليتوضأ " رواه الترميذي. **بەپێی زانستی سەردەم کاتێك تاك تورە دەبێت واباشە شوێنە بەجێبهێلێت و بجێت خۆی فێنك کاتەوە دیارە دەست نوێژ هەردوو ئامانجە دەپێکێت هەم دوور کەوتنەوە لەو ناوەندەی تورەبوون دروست دەکات، لەهەمان کاتدا خۆفێنك کردنەوەشە و کارکردنە سەر ئاستی ئەدرینالین بۆ دابەزین، لەهەمان کاتدا خوێندنی زیکرەکانی کاتی دەست نوێژ ئارام بەخشیەکی ترەو تاك هەست بە ئارامی و شادمانیەکی زۆردەکات.**

**٣-جولەی پەلەکان لەکاتی دەست نوێژو رژانی ئاو بەسەریاندا و پاکبونەوەی پێست لە چەوری سودی زۆر بە خانەکانی پێست و چالاکبونی مولولەکانی خوێن دەگەیەنێت. ئەمەش دەبێتە هۆی هێوربونەوە.**

٤- چاكی و پاكی و جوانی روخسار متمانەو ئارامی بەتاك دەبەخشێت.

٥-شوردنی پەلەكان و دەست هێنان بە پەنجەكانی پەلەكانی خوارەوە و نێوان پەنجەكان جۆرە شێلانێكە دەبێتە هۆی خاوبونەوە و ئارام بەخشین، بەداخەوە زۆر كەس كاتێك دەست نوێژ دەگرن تەنها ئاو دەرشێنن بەسەر پەلەكاندا بەبێ ئەوەی جولەی پێویست بكەن بەو بیانوەی كە پەلەكانیان پاكە و پێویست بەوە ناكات پەنجەكانی پێیان دەستی پێدابێنن لەكاتی شتندا بەمەش تەنها سود لە بەشی یەكەمی دەست نوێژ وەردەگرن كە شتنە بەڵام بەشەكەی تری كە جولەی پەلەكانە و شێلانە لێی سود مەند نابن، بۆیە دەبینیت پاش دەستنوێژیش هێشتا بەتەواوی هێور نەبۆتەوە كە ئەوە ئامادەباشییەكی گرنگە بۆ نوێژكردن.

٦- دەست نوێژ پێش ئەوەی پاكردنەوەی جەستە بێت خۆ ئامادەكردنی دەرونی و روحیە بۆ دیداری خوای بەخشندە و هێوركردنەوەی مێشكە لەهەر نارەحەتیەك و سەرەتایەكە بۆ خۆئامادەكردن دانان بەگوناهەكان و داوای هاوكاری و یارمەتی لە ئەو كەسەی هیچ كات بەندەكانی نائومێدناكات.

نوێژ بەیەكێك لە پایە هەرە گرنگەكانی ئیسلام دادەنرێت و رۆژانە تاك فرمانە لەسەری كە لایەنی كەم پێنج جار نوێژ بكات، خوای بەخشندە لە زیاتر لە ئایەتێكدا باسی فەرزبوون و گرنگی نوێژ دەكات، لێرەدا هەندێك لەو ئایەتانە ئەژمار دەكەین.

﴿ فصل لربك وأنحر﴾ (الكوثر: ٢)

**نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت و قوربانی سەرببڕە.**

﴿ وأقيموا الصلاة وءاتوا الزكاة واركعوا مع الراكعين﴾ (البقرة: ٤٣)

**نوێژبکەن و زەکات بدەن و لەگەڵ کرنۆشبەراندا کرنۆش ببەن.**

﴿ وأقيموا الصلاة وءاتوا الزكاة وماتفعلوا من خير تجدوه عند الله إن الله بما تعملون بصير﴾ (البقرة: ١١٠)

**نوێبکەن و زەکات بدەن، ئەوەی دەیکەن لە چاکە لای پەروەردگار دەستان دەکەوێتەوە پەروەردگار بینەری کردەوەکانتانە.**

﴿ حافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى وقوموا لله قانتين﴾ (البقرة: ٢٣٨)

**ئاگاداری نوێژەکانتان بن بەتایبەتی نوێژی ناوەراست (عەسر) لەنوێژدا بوەستن بۆ خوا بەگەردن کەچی.**

﴿ فإذا قضيتم الصلاة فاذكروا الله قياما وقعودا وعلى جنوبكم فإذا اطمأننتم فأقيموا الصلاة إن الصلاة كانت على المؤمنين كتابا موقوتا﴾ (النساء: ١٠٣).

**کاتێك نوێژەکانتان بەجێهێنا، ئەوسا یادی خوا بکەن بەپێوەو بەدانیشتنەوە و لەسەرتەنیشت(پاڵکەوتن)موە، هەرکات دڵئارام بوون ئەو کات نوێژەکانتان بەرێکوپێکی بکەن بەراستی نوێژ هەمیشە لەسەر باوەرداران فەرزکراوێکی کات بۆ دیاری کراوە.**

﴿ وأن أقيموا الصلاة واتقوه وهو الذي إليه تحشرون) (الأنعام: ٧٢).

نوێژەكانتان بكەن و فرمانی خوا جێبەجێبكەن هەمووتان بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە.

﴿ فإن تابوا وأقاموا الصلاة وءاتوا الزكاة فإخوانكم في الدين ونفصل الأيات لقوم يعلمون﴾ (التوبة: ١١).

ئەگەر پەشیمان بونەوە و نوێژیان كرد و زەكاتیان دا ئەوە براتانن لە ئایینـدا، ئێمە بەڵگەكان روون دەكەینەوە بۆ گەلێك كە دەیزانن. ﴿ قل لعبادي الذين ءامنوا يقيموا الصلاة وينفقوا مما رزقناهم سراً وعلانية من قبل أن يأتي يوم لا بيع فيه ولا خلال﴾ (إبراهيم: ٣١).

ئەی محمد بە بەندەكانم بڵێ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، بەرێكی نوێژبكەن و لەوەی پێمان داون ببەخشن، بەنهێنی و ئاشكرا، پێش ئەوەی رۆژێك بێت نەكڕین و فرۆشتنی تیادایە نە دۆستایەتی.

وقال تعالى: ﴿ وأقيموا الصلاة ولا تكونوا من المشركين﴾ (الروم: ٣١).

نوێژەكانتان بەرێكوپێكی بكەن و لە بێباوەڕان مەبن.

﴿ ماسلككم في سقر★قالوا لم نك من المصلين﴾ (المدثر: ٤٢-٤٣).

چی ئێوەی خستۆتە دۆزەخەوە ووتیان لە ئێمە لە نوێژكەران نەبووین.

﴿ إن الإنسان خلق هلوعا★إذا مسه الشر جزوعا ★ وإذا مسه الخير منوعاً★ إلا المصلين★الذين هم على صلاتهم دائمون﴾ (المعارج: ١٩-٢٣)

مرۆڤ دروستكراوە بە چاوچنۆكی و تەنگەتیلكە كەناخۆشییەكی توش ببێت هاوار و ناڵە دەست پێدەكات كە سامانیش رووی تێبكات

دەیگرێتــەوە (لەخــەڵکی) تــەنها نوێــژخوێنان نــەبێت، ئەوانــەی بەردەوامنن لە نوێژەکانیان.

زیـاتر لـە فەرمودەیـەکیش هەیـە بـاس لـە نوێـژکردن دەکـات -: دەفـەرموێت پێـنج نوێژەکـە و هـەینی بـۆ هـەینی و رەمـەزان بـۆ رەمەزان گوناهەکان ئەشواتەوە بەمەرجێك گوناهی گەورە نـەبێت. " الصلوات الخمس، والجمعة إلى الجمعة، ورمضان إلى رمضان، مكفـرات لما بينهن، ما اجتنبت الكبائر " ( احمد)، هەروەها دەفەرموێت لە نێوان بەندە و کوفر یان هاوەڵدروستکردن بۆ خوا وازهێنانە لە نوێژ " عـن جـابر -صـلى الله عليـه وسـلم- قـال: سمعـت رسـول الله صـلى الله عليـه وسلم يقول: ( بين العبد وبين الكفر أو الشرك ترك الصلاة)" (احمد)

گرنگترین کاریگەریە دەرونیەکانی نوێژ لەسەر تاك:

١- بەدەوامی پەیوەندی نێوان تاك و خوا رۆژی پێنج جار لایـەنی کەم و بە دڵ و زمان و جەستە.

٢- کەمبونەوەی دڵەراوکێی و خـەمۆکی و هەسـتکردن بـەنزیکیت لە خوای بەخشندە و باڵادەست.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ (البقرة ٢٧٧)

ئەوانــەی کــەباوەریان هێنــاوە و کــردەوە باشــەکانیان کــردووە و نوێــژەکانیان بــە هــۆش و گۆشــەوە کــردووەو زەکاتیــان داوە تــەنها پاداشـتیان لای پەروەردگاریانــە وەهـیچ ترسـێکیان لەبـەر نیـە وهـیچ فەخەتێك رویان تێناکات.

٣- شانازی کردن به موسولمان بونت و پەیرەوکردنی ئاینەکەت ئەمە خۆی لە خۆیدا چێژێکی تایبەتی هەیە.

٤- نوێژکردن باشترین چارەسەرە بۆ تورەیی و هەڵچوون بەلام نوێژێك بە خشوع بێت نەك تەنها لەکۆڵکردنەوە. چونکە ئەو نوێژەی خشوعی لەگەڵدا بێت وا لەتاك دەکات هۆشپێدانی باشتر بێت و زاڵبێت بەسەر بیرکردنەوەکانی خۆیدا و لەژیانی رۆژانەی کەمتر هەڵەبکات.

٥- بەیەکێك لە چارەسەرە گرنگەکان دادەنرێت بۆ بێخەوی بەتایبەتی ئەگەر تاك لەکاتی نوێژدا خشوعی هەبێت و پاش نوێژ بەراستی بپارێتەوە لە خوای بەخشندە و بەڵێن بدات هەڵەکانی دووبارە و چەند بارە نەکاتەوە هەست بەئارامی دەکات و بەتەواوەتی خاوبونەوە لە ماسولکەکانی رودەدات و گرژی نامێنێت و چاوەکانی بەئارامتر دەچنە خەو.

٦- هەر یەکە لەئێمە دەشێت ناوبەناو گوناه بکات چ ئەوەی ئاگای لێبێت یان ئاگای لێی نەبێت، بۆیە نوێژ ئەو رەحمەتەیە کەخوای بەخشندە گوناهەکانی تاکی پێدەشواتەوە رۆژی پێنج جار، وەك چۆن ئەگەر روبارێك لەبەردەم ماڵەکەت بێت رۆژانە پێنج جار خۆت بشۆیت جەستەت پاکوخاوێن دەبێت نوێژیش هاوشێوەی ئەوە گوناهەکان دەشواتەوە. " أرأيتم لو أن نهرا بباب أحدكم يغتسل فيه كل يوم خمس مرات هل يبقى من درنه شيء ؟ قالوا: لا يبقى من درنه شيء. قال: فكذلك مثل الصلوات الخمس يمحو الله بهن الخطايا " (رواه البخاري ومسلم)

٧- هەتا لە نوێژکردن خشوعت زیاتر بێت زیاتر هەست بە ئارامی و چێژدەکەیت و رزگاربونت لە گرفت و کێشەکانی ژیان ئاسانتر دەبێت و خەم و پەژارەی دونیا کەمتر کاتت دەبات و هەمیشە هەست بە پالپشتی خوای میهرەبان دەکەیت. ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ * الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾ (المؤمنون ١-٢). بەراستی بڕواداران رزگار دەبن (سەرفرازدەبن) ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا لەخوا ترسن (گەردن کەچن بۆ خوا)

٨- بینینی کۆمەڵە کەسێك و تێکەڵبوونی کۆمەلایەتی کەتاك هەست بە پاڵپشت و بوونی هاورێ دەکات.

٩- بەئاگابوون لە دراوسێ و هاورێ و کەسانی مزگەوت و بەشداری کردن لە چالاکییە کۆمەلایەتیەکان بە خۆش و ناخۆشەوە. بۆیە پێغەمبەر موسولمانان بەجەستەیەك وەسف دەکات کاتێك شوێنکی ئازاری هەبێت هەموو جەستەی بە بێداری و تا بەئاگادەبن بۆی. "مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى" ( متفق عليه) لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت بڕوادار بۆ بڕوادار وەك بینایەك وایە بەشەکانی یەکترپتەودەکەن. "المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا "(مسلم).

١٠- کاتێك تاك بەرانبەر خوای بەخشندە دەوەستێت و داندەنێت بە گوناهەکانی خۆی و بێشەرم و شکاندن داوای لێخۆش بوون دەکات و لەهەمان کاتدا بەوەوە ناوەستێت داوای داپۆشین و بەخشینیش

دەكات، ئەمە تەنها بۆ زاتی خوای گەورە دروستە دەنا چ زاتێك هەیە تۆ بتوانیت لەسەر زەوی ئەو، بەرچاوی ئەوەوە، پاش خواردنی رزقەكانی ئەو، گوناه بكەیت و هەڵە بكەیت و داوای لێخۆش بوون و بەخشینیش بكەی. هەر ئەمە واتلێدەكات هەست بە ئارامی و متمانە و هێوربونەوە بكەیت.

١١- باشتربوونی لایەنی بیركردنەوەو هۆش پێدان بەوەی پێویستت بەخشوع و لەبەركردنی قورئانە.

١٢- پەیوەست بوون بەكات و بەهێزبوونی كەسێتی. بۆیە پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەفەرموێت خۆشەویسترین كار لای خوا كردنی نوێژەكانە لەكاتی خۆییدا.

" عبد الله بن مسعود رضي الله عنه قال: سألت النبي صلى الله عليه وسلم أيُ العمل أحبُ إلى الله تعالى، فقال: " الصلاة لميقاتها " وفي رواية " الصلاة على وقتها " (رواه البخاري ومسلم).

١٣- بێگومان هەموو نوێژێك گرنگی و سودی هەیە بەڵام لەپاش نوێژە فەرزەكان شەونوێژی گرنگی تایبەتی هەیە بۆ پاراستنی جەستە لەزۆر نەخۆشی و بەخشینی هەستی ئارامی و شادمانی بەتاك زۆر لەوە زیاتر كە زانست پەی پێبردووە. " وأفضل صلاة بعد المكتوبة صلاة الليل " ( رواه مسلم).

١٤- هەستكردن بەهاونرخی خوێت كاتێك دەبینیت هەمووان ملكەچن بۆ خوا و جیاوازی نیە لە هەژارو دەولەمەند، لاواز و بەهێز، پیشەوەر و بێكار، دەستەلاتدار و بێدەستەڵات، تەنها بە تەقوا

نــەبێت ئــەویش لەدڵدایــە و دەتوانیــت تــۆ لەهــەموو کــەس بەتەقواتربیت.

١٥- پتـەوبوونی پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی و کاتێـك گرفتـت دەبێـت زیـاتر لـە کەسـێك بەهاناتـەوە دێـت زۆر کـات پـێش ئـەوەی کەسـە نزیکەکانی خۆت بگات.

١٦- لـە نوێـژی هەینیـدا کۆمەڵەکـە گـەورەتر دەبێـت هەنـدێك تـر لـەدەرەوەی بازنـەی دراوسـێ دەبینیـت و بـەئاگادەبیت لـە بـارودۆخی کۆمەڵایەتیان.

١٧- نوێژی جەژن تام و چێژێکی تایبـەتی هەیـە و جەژنـە پـیرۆزە لەنێوان موسمانان لەو کاتەدا خۆشی ئارامیەکی ترت دەداتێ.

١٨- بێگومان پاداشتی نوێژی جەماعەت لە نوێـژی تـاك زیـاترە بـە نزیکەی (٢٥) هێنـدە، چونکە بەهەر هەنگاوێك بۆ مزگەوت خێرت بـۆ دەنوسرێت و بەهەر هەنگاوێکی گەرانەوە گوناهت دەشواتەوە و سلاو کردنت لە موسولمانان خێـرە و وەڵامدانـەوەت بـۆ سلاوی ئـەوان هـەر خێرە و جێبەجێکردنی سونەکانی چونە مزگەوت و سـونەتی نوێـژی مزگەوت هـەمووی هـەر خێـرە، بـەدووربونت لەهەڵە لـەکاتی نوێـژدا خێرێکی ترە. " صلاة الرجل في الجماعة تضعف على صلاته في بيتـه وفي سوقه خمسة وعشرين ضعفاً " ( متفق عليه).

١٩- لـە رۆژگـاری ئـەمرۆدا زۆر بـاس لـە ووزەی ئـەرێنی و نـەرێنی دەکرێت ( پۆزەتیف و نەگـەتیف) لـەو بـاوەرەدا نـیم هـیچ چـالاکیەك هێندەی نوێژ ووزەی ئەرێنی بدات بە تاك.

٢٠- نوێـژ وات لێـدەكات لـە خراپـە و خراپـەكاری دوور بكەوێتـە، هـەموو سەرچـاوەكانیش كـۆكن لەسـەر ئـەوەی كاتێـك تـاك كـارێكی خراپـە دەكـات هەسـت بـە نائـارامی و دڵـەراوكێ دەكـات و تـرس دایدەگرێت و هەندێك كات دڵتەنگی و خەمۆكی و لۆمـەكردنی خـود.

﴿اتلُ مَا أُوحِيَ إِلَيكَ مِنَ الكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنهَى عَنِ الفَحشَاءِ وَالمُنكَرِ وَلَذِكرُ اللَّهِ أَكبَرُ وَاللَّهُ يَعلَمُ مَا تَصنَعُونَ﴾.
(العنكبوت ٤٥)

بخوێنـەرەوە ئـەو قورئانـەی كەسـروش كـراوە بـۆت، نوێژبكـە بێگومان نوێژ بەرگری دەكات لـە كـاری ناشـرین و ناسـەند وەزیكـر و یادی خوا گەورەترە لەهەموو شتێك خـواش بەهـەركارێك كەدەیكـەن دەزانێت.



## رۆژو کاریگەری دەرونی

یـەکێکی تـر لەپایـە گرنگـەکانی ئیسـلام، رۆژوگرتنـە، چ رۆژووی مـانگی رەمـەزان کـە فـەرزە لەسـەر هـەموو موسـوڵمانێك بەمـەرجێك بیانویەکی شەرعی نەبێت تا رۆژووە سونەتەکان بێـت ( دوو شـەممە و پێنـج شەممە، یەکەم شەش رۆژی مانگی شوال لە ٢ی شـەوالەوە، نـۆ رۆژی یەکـــەمی ذي الحجـــة یـــان تـــەنها رۆژی عەرەفـــە، نـــۆ و دەی موحەرەم،، سێ رۆژی ناوەراستی هـەموو مـانگێکی ئیسلامی کـەمانگ لەپربوندایە (١٣،١٤،١٥ ی مانگی کۆچـی). بێگومـان ئـەم فـەرزە گرنگـە بێ سودی جەستەیی و دەرونی و کۆمەڵایەتی نیە، لێرەدا تـەنها بـاس لە سودی کۆمەڵایەتی و دەرونی دەکەین:

هەندێك لەو ئایەت و فەرمودانەی باس لە رۆژوو دەکەن:

١- ﴿يا أيُها الذين آمنوا كُتبَ عليكُمْ الصّيامُ كمَا كُتبَ على الـذين من قبلِكُمْ لعلكُمْ تتقُون﴾ (سورة البقرة ١٨٣)

ئەی ئەوانەی باوەرتان هێناوە رۆژوتان لەسـەر نوسـراوە هـەروەك ئەوەی نوسراوە لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە بەڵکو خۆتان بپارێزن.

٢- ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّـنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ (سورة البقرة ١٨٥).

مانگی رەمەزان مانگێکە قورئانی تێدا هاتۆتـە خـوارەوە، بـەرێنما بۆ خەڵکی و بەڵگەی رۆشن، بۆ رێنمونیی و جیاکردنەوە، هەرکەسێك لەئێوە مانگی بینی بابەرۆژوبێت.

٣- لەفەرمودەیەکـدا پێغەمبـەر ﴿د.خ﴾ خـوا دەفـەرموێت ( رۆژوو مـانگی رەمـەزان گوناهـەکان دەسـرێتەوە) ("مَـنْ صَـامَ رَمَضَـان إيمَانًا وَاحتِسَابًا، غُفِرَ لهُ مَا تقدّمَ مِنْ ذنبِه" ( متفق عليه).

هـەر كەسـێك ڕەمـەزان بـەڕۆژوو بێـت بـەباوەر و بەدروسـتی، پەروەردگار لەگوناهەكانی پێشووی خۆش دەبێت.

٤- لەرەمەزانـدا دەرگاكـانی ئاسمـان دەكرێتـەوە، وەدەرگاكـانی دۆزەخ دادەخرێـت، شـەیتانەكان دەبەسـترێنەوە. " إذا دَخـَـلَ شَـهرُ رَمضانَ فُتحتْ أبوَابُ السَّماءِ، وَغُلقَتْ أبوَابُ جهنّمَ، وَسُلسِلتِ الشَّياطِينُ " ( متفق علیه).

٥- ئـەوەی وازنـەهێنێت لـە شـایەتی درۆ و كـردار كـردن پێـی خوای پێویستی بەوە نیە واز لە خواردن و خواردنـەوە بهێنێـت "مـن لم يـدع قـول الـزور والعمـلَ بـه والجهـلَ فلـيس لله حاجـةٌ في أن يـدع طعامـه وشـرابه" (رواه البخـاري). ئەمـەش بەڵگەیـە كـە لەئیسـلامدا ڕۆژو تەنها ڕۆژووی جەستە نیـە بـەڵكو ڕۆژووی زمـان و خۆپاراستنە لەزیان گەیاندن بە كەسانی تر.

٦- لـە فەرمودەیـەكی تـردا پێغەمبـەر ﴿د.خ﴾ دەفـەرموێت دەشـێت ڕۆژەوانێـك جگـە لەبرسـێتی و تـوێنێتی هیچـی تـری دەسـت نەكـەوێت، دیـارە مەبەسـت لێـی ئـەو كەسـانەیە كـە تـەنها خۆیـان لـەخواردن و خواردنـەوە دەگرنـەوە بـەڵام زمـان و ڕەفتاریـان زیـان گەیاندنـە بەكەسـانی تـر " رب صـائم لـيس لـه مـن صـيامه إلا الجـوع والعطش، ورب قائم لـيس لـه مـن قيامـه إلا الهسـر والحمـى" (احمـد و النسائي و ابن ماجة).

سودەكانی:

١- ئارامی دەرون.

٢- خۆشی و شادی كاتێك عیبادەتێك دەكەی و دەگەیتە ئەنجام.



٣- خەمۆکی یەکێکە لە نەخۆشییە دەروونیەکان کە نزیکەی (١٠٪) هاوڵاتیان توشی دەبن، لە مانگی رەمەزاندا ئەم حاڵەتە کەمترە یان ئەگەر پێشتریش هەبێت ئەوە لە رەمەزاندا بەرەو باشی دەروات بەهۆی ئەوەی یەکێك لە هەنگاوەکانی چارەسەر بریتیە لە پاڵپشتی کۆمەڵاتی دیارە لە مانگی رەمەزاندا پاڵپشتی کۆمەڵایەتی لەهەموو کات زیاترە بەهۆی ئەوەی

- خێزان زیاتر بەیەکەوە کۆدەبنەوە لە کاتی بەربانگ.
- یەکێك لەنیشانەکانی خەمۆکی بێخەویە لەم مانگەدا لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی بەرچاوی خێزانەکان ناخەون تا پارشێو دەبێتە پاڵپشتێکی تر بۆ نەخۆشەکە کەهەست بە تەنهایی نەکات.
- سەردانی مزگەوت و نوێژی تەراویح و زۆرجار نوێژی بەیانیان کەبەکۆمەڵ دەکرێت لەرەمەزاندا دەبێتە گەورەترین پاڵپشت و چالاکی کۆمەڵایەتی کە نەخۆش زۆر سودمەند دەبێت لێی.
- زۆرجار سەردان و چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان لەمانگی رەمەزاندا زیاترە بەناوی دەعوەت کردن و خواردنی نانی یەکتر.
- بەخشین لە مانگی رەمەزاندا زیاتر دەبێت و سەرجەم سەرچاوە زانستیەکان کۆکن لەسەر ئەوەی بەخشین دەبێتە ئارامی و خۆشحاڵی تاك.

٤- باشترین چارەسەرە بۆ دڵەراوکێ و ترس بەتایبەتی کەدەزانین دڵەکان بەزیکری خوا ئارام دەبنەوە، ئاشکراشە مرۆڤ لە رەمەزاندا و لەکاتی بەرۆژوبووندا زیاتر زیکری خوا دەکات.

٥- هەنـدێك كـەس توشـی دڵـەراوكێ و دڵتـەنگی دەبێـت بـەهۆی كێشی زیـادەوە بـەرۆژبوون یەكێكـە لـە چارەسـەرە كاریگـەرەكان بـۆ دابەزاندنی كێش و هەستكردن بە هاوسەنگی.

٦- زاڵبوون بەسەر تورەییدا بۆیە پێغەمبـەر ﴿د.خ﴾ دەفـەرموێت ئەگـەر كەسـێك قسـەی پێـوتن وەڵامـی مەدەنـەوە تـەنها بڵـێن مـن بەرۆژوم ئەمەش بەڵگەیـەكی تـرە كـەرۆژ تـەنها خۆگرتنـەوە نیـە لـە خواردن و خواردنەوە بەڵكو خۆپارێزیە لە ئازاردانی كەسانی تر.

٧- رێگریەكی زۆرباشە لە خۆكوژی بەهۆی پتـەوی بـاوەر لـە كـاتی بەرۆژوبوندا و كەمبونەوەی خەمۆكی و پاڵپشتی پتـەوی كۆمەڵایـەتی و خێزانـی و بـەدووربوون لـە مـادە هۆشـبەرەكان و زاڵبـوون بەسـەر تورەیی كە هەموویان هۆكارن بۆ خۆكوشتن.

٨- كەمكردنـەوەی بـەكارهێنانی مـادەی هۆشـبەر یـان تەنانـەت چارەسـەركردنی ئـالوودەبوون، بەتایبـەتی لـەمانگی رەمەزانـدا لەزۆربـەی وولاتـە ئیسـلامیەكاندا بـەكارهێنانی جگـەرە و ئـەلكحول ومادە هۆشبەرەكان بەشێوەیەكی بەرچاو كەمدەبێتـەوە، لـە هەنـدێك داتـادا بـاس لـە رێـژەی لەسـەدا (٥٠٪)ی كەمبونـەوەی بـەكارهێنان دەكات.

٩- زاڵبـوون بەسـەر خـووە خراپەكانـدا و كـۆنترۆلكردنی ئـەو رەفتارانـەی كـەتاك ناتوانێـت لـەكاتی ئاسـاییدا زاڵبێـت بەسـەریدا ( روانینە كەناڵە سێكسیەكان، هەندێك خوی سێكسی نادروست،...).

١٠- كاریگـەری گـەورەی هەیـە لەسـەر پتـەوبوونی كەسـێتی، متمانەبـەخۆبوون، باشـتربوونی پەیوەنـدی خێزانـی، هـەڵگرتنی بەرپرسیارێتی و زاڵبوون بەسەر برسێتی و تونێتی و شەهوەت.

ئایا ئەوەی نەخۆشی دەرونی هەیە رۆژوی لەسەرە؟

نەخۆشی دەرونی بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت بەدوو کۆمەڵەوە ( نەخۆشی دەرونی، نەخۆشی هۆشمەندی) ئەوانەی نەخۆشی دەرونیان هەیە وەك کەسێکی ئاسای رۆژووی لەسەرە تەنها لەحاڵەتێکدا نەبێت کە بیانوی تەندروستی یان شەرعی هەبێت، لەهەندێك حاڵەتی کەمدا ناتوانێت بەرۆژوو بێت ئەویش دەتوانرێت لەکاتی هەڵسەنگاندی نەخۆشەکە ئەو بریارە بدرێت.

ئەوانەی نەخۆشی هۆشمەندیان هەیە برێکی زۆریان رۆژوی لەسەر نیە چونکە ئاگایی لە نەخۆشییەکەی نیە یان ناتوانێت بەبێی پێویست پەیوەست بێت بە رێنمایی و فرمانە ئایینەکانەوە.

ئایا نەخۆشانی دەرونی رۆژوو بگرن باشە یان نا؟

ئەگەری رێگری تەندروستی نەبێت گومانی تیا نیە بەرۆژوو بوون بەسوودە بۆ هەموو کەسێك چ نەخۆش بێت یان تەندروست، ئەوانەی نەخۆشی دەرونیان هەیە زۆربەیان لەرۆژوو سودمەند دەبن بەتایبەتی ئەگەر کەسەکە خۆی پێی خۆش بێت، ئەوانەی حاڵەتی هۆشمەندیان هەیە ئەگەر کەسەکە خۆی حەزبکات شتێکی باش و تەندروستە ئەگەر ئارەزوو نەکات نابێت فشاری لێبکرێت بۆ بەرۆژوو بوون چونکە زۆربەیان رۆژویان لەسەر نیە.

زەكات و كاريگەرى دەرونى

**لەبەر ئەوەى زەكات يەكێكە لە پايە گرنگەكانى ئيسلام و سودەكەى تەنها بۆ تاكى بەخشەر و تاكى وەرگر نيە بەڵكو بۆ سەرجەم كۆمەڵگەيە، بۆيە لە قورئاندا لەزۆر شوێن باس لە فەرزبوون و گرنگى زەكات و خێركردن دەكات، لێرەدا هەندێك لەو ئايەتانە باس دەكەين بە راڤەكانيانەوە بە كوردى.**

﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾ (٤٣) (البقرة).

**نوێژبكەن و زەكات بدەن و كرنۆش ببەن لەگەڵ كرنۆش بەراندا..**

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِنْكُمْ وَأَنْتُمْ مُعْرِضُونَ (٨٣) (البقرة).

**بيربكەنەوە كاتێك پەيمانمان لە جولەكە وەرگرت، كە هيچ شتێك نەپەرستن جگە لە خوا وەچاكە بكەن لەگەڵ دايك و باوك، خزمان و هەتيوان و بێچاران، وەقسەى جوان بكەن لەگەڵ خەڵكيدا، وە نوێژبكەن و زەكات بدەن، ئينجا پشتان هەڵكرد كەمێكتان نەبێت، ئێوە پشت هەڵكەرن.**

﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنْفُسِكُمْ مِنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِنْدَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (١١٠) (البقرة)



نوێژبکەن و زەکات بدەن و ئەوەی بۆ خۆتانی پێش دەخەن لەکاری چاکە لای پەروەردگار دەیبیننەوە، بەراستی خوا بینەری کردارەکانتانە.

﴿قد أفلح المؤمنون (١) الذين هم في صلاتهم خاشعون (٢) والذين هم عن اللغو معرضون (٣) والذين هم للزكاة فاعلون﴾ )المؤمنون).

**بەراستی باوەرداران رزگاردەبن (سەرفرازدەبن) ئەوانەی لە نوێژەکانیان ملکەچن، وەئەوانەی لە شتی بێهودە خۆیان بەدوور دەگرن، وە ئەوانەی زەکاتی سامانیان دەردەکەن.**

﴿ الذين إن مكناهم في الأرض أقاموا الصلاة وآتوا الزكاة وأمروا بالمعروف ونهوا عن المنكر﴾ سورة الحج (٤١)

**ئەوانەی ئەگەر دەستەلاتمان پێدان لەزەویدا بەچاکی نوێژ بەجێ دەهێنن و زەکات دەدەن و فەرمان دەدەن بە چاکە و بەرگری دەکەن لە خراپە و سەرئەنجامی هەموو کارەکان تەنها بەدەست خوایە.**

﴿ رجال لا تلهيهم تجارة ولا بيع عن ذكر الله وإقام الصلاة وإيتاء الزكاة﴾ سورة النور (٣٧)

**پیاوانێك بازرگانی و كرین و فرۆشتن بێ ئاگایان ناكات لە زیكری خوا و نوێژكردن و زەكاتدان.**

﴿ وأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة وأطيعوا الرسول لعلكم ترحمون﴾ سورة النور (٥٦)

**نوێژبکەن و زەکات بدەن و گوێرایەلی پێغەمبەر بن تا خوا رەحمتان پێبکات.**

﴿ الـذين يقيمـون الصَلاة ويؤتـون الزكـاة وهـم بـالآخرة هـم يوقنون﴾ سورة النمل (٣)

**ئەوانەی نوێژدەکەن و زەکـات دەدەن و باوەریـان پـتەوە بـە رۆژی دوایی.**

**ئەگـەر سـەرنج بـدەین لەزۆربـەی ئایەتـەکانی کـەباس لەنوێـژ دەکات لەگەڵیدا باس لە زەکاتیش دەکات ئەوەش واتایەکە بـۆ گرنگـی ئەم پایەیەی باوەر لە ئیسلامدا.**

**١- زەکـات پـێش ئـەوەی کردارێکـی دارایـی بێـت پرۆسـەیەکی دەروونیەو لەگەڵ تاکدا گەشە دەکات بەهۆی فێربـوونی لـە دەوروبـەر، چـونکە بەخشـین دەبێـت بکەیتـە پێکەیشـتنی دارایـی لـەرووی دەروونیەوە نەك لەرووی مادیەوە بۆیە دەبینیت هەزارەها کـەس هـەن پـارەی زۆریـان هەیـە نـاتوانن ببەخشـن ئەوانـە لـەرووی دەروونیـەوە نەگەشتونەتە پێگەشتنی دارایی دەروونیەوە بۆیـە هەمیشـە لـەترس و دڵەراوکێدا دەژین نەوەك سامانەکەیان کەم بکات، بەڵام دەبینیـت زۆر کـەس هـەن لـەرووی داراییـەوە لـەوانی تـر کـەمتریان هەیـە داهاتیـان کـەمترە بـەڵام بەخشـندەترن و زیـاتر دەبەخشـن لەبـەر ئـەوەی کاملبوونی دەروونیـان هەیـە و هەسـتی مـرۆڤ دۆسـتیان لـە ئاسـتێکی بەرزدایە.**

**٢-زەکـات والـەتاك دەکـات هەسـتی خۆپەرسـتی و موڵکـداری کەمبێتەوە، ئەیپارێزێت لەهەستی لۆمەکردنی خود و هەستکردن بـە تاوانباری لەئەنجامی هەندێك هەڵەو گوناهی رۆژانە کە هەندێك کات**

سەردەكێشێت بۆ هەندێك نەخۆشی دەرونی.: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوالِهِمْ صَدقةً تُطهِّرُهُمْ وتُزَكِّيهِمْ بِها﴾ (التوبة: ١٠٣).: وەربگرە لە ماڵ و داراییان سەدەقەیەك كەبەهۆیەوە پاكیان دەكەیتەوە و دڵیان پوخت و خاوێن دەكەیت بەو ماڵ بەخشینە.

﴿ومَنْ يُوقَ شُحَّ نفسِهِ فأولئِكَ هُمُ المُفلِحُونَ﴾ (الحشر: ٩)، ئەو كەسەی خۆی لە رژدی دەرونی دەپارێزێت بەراستی هەر ئەوان سەرفرازن

٣- كەمكردنەوەی هەستی رق و كینە لەناو چینەكانی كۆمەڵ و بڵاوبونەوەی هەستی ئارامی و رێز و خۆشەویستی لەنێوان تاكەكانی كۆمەڵ، دیارە ئەگەر كۆمەڵیش بە خۆشی و شادی ژیان بەسەر بەرێت و خۆشەویستی لەنیوان تاكەكانی كۆمەڵ هەبێت ئەگەری زۆربەی نەخۆشییە جەستەیی و دەرونییەكان كەمدەبێتەوە.

٤- بەخشین بەیەكێك لە رێگە كاریگەریەكان دادەنرێت بۆ چارەسەری دڵەراوكێ و خەمۆكی و تاك پاش بەخشین هەست بە شادمانی دەكات، غاندی دەڵێت خۆشی ئەوە نیە چەندت دەست دەكەوێت ئەوەیە دەتوانیت چەند ببەخشیت. لەقورئانی پیرۆزدا زۆر بەجوانی باسی لەو كەسە دەكات كە دەبەخشێت و ئەوەی نابەخشێت و خوای بەخشندە چۆن كاریان بۆ ئاسان و گران دەكات.

﴿أمَّا مَنْ أعطَى واتَّقَى * وصَدَّقَ بالحُسنى * فسنيسِّرُهُ لليُسرى * وأمَّا مَنْ بَخِلَ واستغنى * وكَذَّبَ بالحُسنى * فسنيسِّرُهُ للعُسرى﴾ (الليل: ٨ - ١٠). ئەو كەسەی ماڵ ببەخشێت و لەخوابترسێت و

پارێزگاربێت، وەبروای ببێت بەوەی چاکە بکات ئەوە زوو پارمەتی دەدەین بۆ ڕێی ئاسان، ئەو کەسەی ڕژدی بکات و خۆی بێ نیاز بزانێ وەبروای نەبێت بەچاکە ئەوە زوو دەیخەینە سەر ڕێی سەخت.

٥- نزیك بوونەوەی تاك لەخوا ئەمەش وا لەتاك دەکات هەست بە ڕەزامەندی خوای بەخشندە بکات و هەست بە ئارامی و متمانەبەخۆبوون بکات. پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەفەرموێت خێرکردن گوناه دەکوژێنێتەوە وەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە " الصدقة تطفىء الخطيئة، كما يطفىء الماء النار " ( احمد، النسائي، الترمذي و ابن ماجة).

٦- ئەوانەی زەکات دەدەن لەرووی کۆمەڵایەتیەوە چالاکترن و حەز بە پەیوەندی کۆمەڵایەتی دەکەن چونکە کاتێك دەبیستن کەسێك هەژارە دەچن بە هانایەوە و هاوکاری دەکەن، بەڵام ئەوانەی ڕەزیل و دڵنیان نایەت بەخشندە بن پەیوەندی کۆمەڵایەتیان کەمە و حەز بە تێکەڵی ناکەن نەوەك کەسێك داوای هاوکاریان لێبکات، زۆر کات هاوەڵی ئەو کەسانە دەکەن کە هاوشێوەی خۆیانە. بەمەش لە بەشێکی زۆری کۆمەڵگە دادەبرێت و زیاتر هاوەڵی کۆمەڵە کاغەزێك دەکەن کە پاش ماوەیەك جگە لەوەی تەنها ژمارەیەکە هیچ واتایەکی تر نابەخشێت بەڵکو زۆر کات دەبێت وەك پاسەوان هەمیشە ئاگای لەو کاغەزانە بێت نەك لەدەستی بچێت.

﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ.........﴾ (ال عمران ١٨٠)

هەرگیز وا گومان نەبەن ئەوانەی کەچروکی دەکەن بەوەی خوا پێی بەخشیون لەرێز و بەهرەی خۆی کەئەو چرۆکیە چاکترە بۆیان بەڵکو ئەوە خراپە بۆیان بەزووی ئەوەی چروکیان پێدەکرد وەك تەوق دەکرێتە ملیان لەپاشە رۆژدا...



## حەج و کاریگەری دەرونی

إنّ أوّل بيتٍ وُضع للنّاس للّذي ببكّة مُباركًا وهُدًى للعالمين (٩٦) فيهِ آياتٌ بيّنات مقامُ إبراهيم ومَن دخلهُ كان آمنًا ولله على النّاسِ حجّ البيت من استطاع إليهِ سبيلًا ومَن كفر فإنّ الله غنيّ عن العالمين (٩٧)﴾ (آل عمران).

**بەراستی یەکەم ماڵێک کەدانراوە بۆ خواپەرستی ئەو ماڵەیە کەلەمەککە دایە، پیرۆزکراوە و رێنموییە بۆ جیهان، تیایدایە چەند بەڵگەو نیشانەی روون کە شوێن وەستانەکەی ئیبراهیمە، وەهەرکەس چووبێتە ئەو شوێنە بێ ترس بووە بۆ خوا هەیە بەسەر ئادەمییەوە سەردانی ئەو ماڵە بۆ هەر کەسێك کەتوانای گەیشتن (رۆیشتنی) هەبێت بۆی، وەهەر کەس باوەری نەبێت ئەوە خوا بێ نیازە لەهەموو جیهانیان.**

﴿وأذّن في الناسِ بالحج يأتوك رجالاً وعلى كل ضامرٍ يأتين من كل فج عميق﴾ (الحج ٢٧)

**جاربدە بەناو خەڵکیدا بۆ حەج کردن، دێن بۆ لات بە پیادە و بەسوار هەموو حوشترێکی لاواز کەلەهەموو رێگاکانی دوورەوە دێن**

**سودەکانی حەج:**

**١- گومانی تێدا نیە گرفت و نارەحەتیەکانی ژیان والەمرۆڤ دەکات توشی بێزاری بارگاوییبون ببێت بە ئایۆنە نەگەتیفەکان و هەست بە شەکەتی بکات لە ئەنجامی کاری بەردەوام بۆیە زانستی ئەمرۆ رێنمایی تاك دەکات کە ناوبەناو بۆ ئارامبوونەی ناخ و**

جەستە گەشت بکات خۆی لە فشاری کار و پیشە دوور بخاتەوە، حەج بە باشترین گەشت دادەنرێت سەرەرای ماندوو بونەکەی، ئەگەر لە حاجیان بپرسیت هەست بەچی دەکەیت و ئارەزووی چی دەکەیت زۆربەی زۆری دەڵێت خۆشییەك وەسف ناکرێت و حەز دەکەم هەموو ساڵێك ئەمە دووبارە بکەمەوە، تەنانەت تاك هێندە هەست بە ئارامی و متمانەبەخۆبوون دەکات، تاکە گەشتێکە زۆربەی ئەوانەی دەرۆن دەڵێن ئەگەر مردین لاشەکەمان مەهێننەوە با لەوێ بماننێژن، برێکی بەرچاوی بەتەمەنەکان ئاواتە خوازی مردن دەکات لە کاتی گەشتەکەدا چونکە هێندە لە خواوە نزیك دەبێت ئارەزووی دیداری دەکات.

٢-تاك لەم گەشتەدا هەست بە ووزەیەکی سەیر دەکات بەهۆی بوونی بەکۆمەڵ و بەپێی زانستی ووزە رەنگە نزیك بوون لە بەردی رەش و ووزەی بەکۆمەڵ ئەو کاریگەریە ئەرێنیە لەسەر تاك دابنێت.

٣-وەستان لە کێوی عەرەفە و دوعاکردن و ووردبوونەوە و تێرامانکردن بە شێوازێکی دروستی چارەسەری دڵەراوکێ دادەنرێت، هەروەها بە کارێکی گرنگ دادەنرێت بۆ رێکخستنی هاوسەنگی جەستە و گیان، دوعاکردنیش کاریگەری باشی دەبێت بۆ خۆبەتاڵکردنەوە لە فشار و نارەحەتیەکانی ژیان و سەرەتای ئومێد و هیوابوون بە ئایندەیەکی باشتر.

٤- چارەسەر بە رەنگ، روانیە هەندێك رەنگ و خەیاڵکردنەوە لە هەندێك دیمەن کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر تەندروستی تاك و



لـەرۆژگاری ئـەمرۆدا وەك بەشـێك لـە زانسـت بـەكاردەهێنرێت بـۆ چارەسەری هەندێك حاڵەت، دیارە لای تـاكی بـروادار هـیچ دیمـەنێك هێندەی دیمەنی كەعبەی پیرۆز جوان و كاریگەر نیە لەناخیدا و ئـەو دیمەنەی دونیایەك مێژوو و ئێستای تێكەڵ بووە زۆر بـەخێرایی كـار لەناخی تاك دەكات و دەیگەیەنێتە لوتكـەی ئـارامی و خۆشـی و چـێژ بەخشن.

٥- پێغەمبەر له فەرموودەیەكدا دەفەرموێت ئەوەی حەج بكـات و قسـەی نەشـیاو و كـاری هەڵـە نـەكات وەكـو ئـەو رۆژەی لێـدێت كـە لەدایك بووە، "من حج فلم يرفث ولم يفسق رجع كيـوم ولدتـه أمـه" (متفق عليه).

نوسـەر ( سـپیف تشاندلر) لەپـەرتوكی ( سـەد رێگـە بـۆ هانـدانی خـود)دا دەڵێـت زۆر گرنگـە ئـەو ئامانجـەی دەتـەوێت بیگـەیتێ لـە مێشـكتا هـەبێت بەبـەردەوامی، چـونكە ئـەوە یارمـەتیت دەكـات بـۆ گەیشتن پێی، ئەگـەر ئەنجامتـدا وەكـو ئەوەیـە تـازە لـەدایك بووبیـت، ئێمـە هەمیشـە لەگـەڵ نـەفس و شـەیتاندا لەشـەرین و تـاوێ ئێمـە سـەردەكەوین و تاوێـك ئـەوان فریومـان دەدەن، لـە حـەج و لـەكاتی بەردبارانكردنی شەیتان بەبەرد (خۆ روونە شەیتان لـەوێ نیـە بـەڵام ئاماژەیەكی مێژوویە بۆ بـوونی) ئەگـەر بـەجوانی خـەیاڵی بـدەیتێ و لەگـەڵ هـەموو بەرهاویشـتنێكدا وابزانـی بەراسـتی بـەرد دەگریتـە شـەیتان وەكـو سـاتی لـەدایبكونت ناخـت پاكدەبێتـەوە و هەسـت بـە ئارامی و خۆشییەكی بێهاوتا لەناخدا دەچەسپێت.

٦-سەردانیکردنی کەعبە و مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ) و هەندێك لە شوێنەوارە مێژوویەکان کە پەیوەندارە بە مێژووی بانگەوازی ئیسلام لای زۆربەمان خەونێکی گەورەیە و بەدیهاتنی ئەو خەونە بەراوورد ناکرێت بە گەشتێك کە بچیت سەردانی وولاتێك بکەی هەندێك سەوزای و چەند کوشك و تەلار و سەیرانگایەك ببینی و بگەرێتەوە، راستە ئەمەش گرنگە و چێژی خۆی هەیە و لەرووی دەرونیەوە کاریگەری گەورەی هەیە لەکەمکردنەوەی فشارەکانی ژیان و نوێبونەوە و وەرگرتنی ووزەی ئەرێنی و چالاکبونەوە لە کار و پیشە بەلاّم ئەو دوو گەشتە زۆر ئەستەمە بخرێنە دوو تای تەرازووەوە بۆ بەراووردکاری. دەشێت زۆرجار ببیستین تاکێك دوای گەشتێك لەبری چێژ و خۆشی سکالاّی هەبێت کە هەستی بە ماندوێتی کردووە، شتەکانی بەدڵ نەبووە، گەشتەکە ئەوە نەبووە کە چاوەرێی کردووە، گلەیی لە شوێنی خەو و خواردن هەبێت، نەزانینی زمان.... هتد. نالێم ئەمە لە حەجدا روونادات بەلاّم زۆر کەمە.

٧ حەج خولێکی کرداریە بۆ ئارامگرتن و زاڵبوون بەسەر ناخ و شەهوەتەکاندا و خۆبەدوور گرتن لە مقومۆی بێ ئەنجام و رزگاربوون لە تورەبوون و غەیبەت کردن و بەفیڕۆدانی کات بەڵکو تاك هەوڵدەدات لەو خولە کردارییەدا زۆرترین پاداشت وەرگرێت و خۆی لە زۆرترین بری گوناه پاککاتەوە بۆیە خوای بەخشندە لە قورئاندا دەفەرموێت ﴿الحج أشهرٌ معلومات فمن فرض فيهن الحج فلا رفث ولا فسوق ولا جدال في الحج..﴾ (البقرة ١٩٧). حەج لە چەند

مانگێکی دیاری کراودایە هەر کەسێك لەم مانگانەدا حەجی لەسەر خۆی پێویست کرد بائیتر نەچێتە لای ژن و بەدکاری و دەمەقاڵێ نەکات لە حەجدا.

٨-راوێژکاری دەرونی (د. ئەحمد عكاشە) دەڵێت باشترین شت کە حاجی پێیدێتەوە لەحەج ئەو پاکی دەرون و هاوسەنگی مەزاجەیە کە زاڵبووە بەسەریدا لەگەشتەکەیدا لەدەرچوونی لەماڵ تا گەڕانەوەی.

٩-حەج کردن بەهێزبوونی متمانە و جیهادی دەرونە، روونە کە حەجکردن پێویستی بە پارە و کات و توانای جەستەیی و پلان دانان و لێبران و خۆپارێزی لە خراپە و بەدەستهێنانی چاکە ئەمەش بەهەموو کەس ناکرێت بۆیە ئەوەی حەج دەکات پاش گەڕانەوەی متمانەی بەخۆی زیاد دەبێت ئەگەر خاوەن هەر پیشەیەك بێت و گۆڕانکاری لە هەڵسوکەوتیدا دەبێت ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێت.

١٠- ناسینی کەسانی تر و گۆڕینەوە زانیاری و گفتوگۆ لەسەر بابەتە گرنگەکان بەلام بەبێ مقومۆی نادروست. یا أیها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا إن أكرمكم عند الله أتقاكم..(١٣)} (الحجرات). ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان بەدیهێناوە لە نێر و مێ و ئێوەمان کردووە بەچەند میللەت و هۆزێکەوە بۆ ئەوەی یەکتر بناسن بەرێزترینتان لای پەروەردگار خۆپارێزترینانە.

## سەرچاوەكان:


كوردی:

١- قورئانی پیرۆز.

٢-پوختـەی تەفسـیری قورئـان، ئامـادەكردنی: مـەلا محمـد مـەلا صالح.٢٠٠٧.

٣-تەفسیری رۆشن، ئامادەكردنی بورهان محمد أمین، ٢٠١٢.

٤-گوزەرێـك بـەژیانی پێغەمبـەری ئـەمین ﴿د.خ﴾، وەرگێرانـی باوكی عبدالرحمن خۆشناو، ٢٠١٤.

٥- بلاوكراوەيـەكی رێكخـراوی وچـان (دەرون دروسـتی) بـۆ خـولی راهێنانی توێژەران.

عەرەبی:

٦-تـاريخ الطـب النفسـي في بـلاد المسلمين، مجلـة حـراء العـدد (٤١) السنة التاسعة، مارس –ابريل ٢٠١٤، أ.د. طارق بن علي الحبيب.

٧-د. راغب السرجاني – قصة العلوم الطبية في الحضارة الإسلامية

٨-الدين والصحة النفسية د. ازاد علي اسماعيل ٢٠١٤ المعهد العالمي للفكر الاسلامي.

٩- حالات ترث فيها المرأة اكثر من الرجل، د. شوقي العلام، ٢٠١٨

١٠- الضغوط النفسية وطرق التعامل معها في القرآن الكريم د. جميـل حسن الطهراوي

١١-محاولة انتحار المعصوم.. أكذوبة في صحيح البخاري، محمد ابن الأزرق الأنجري، ٢٠١٥.

١٢- الرد على شبهة محاولة انتحار النبي، اسلام ويب، ٢٠١٤.

١٣- التـوازن النفسـي و السـلوكي في شخصـية رسـول الله، د. خالـد سعد النجار.

١٤- مظاهر التوازن في عبادة الرسول، سناء الدويكات، ٢٠١٧.

١٥- الاضـطرابات النفسـية و علاجهـا في القـران الكـريم، رحيـل بهيج، ٢٠١٣.

١٦- الأثر الاجتماعي في الصلاة، د. فتحي محمد الزغبي، ٢٠١٦.

١٧- حقيقة الـنفس في القـران الكـريم ومعانيهـا، صـلام بـن سمـير محمد مفتاح.٢٠١٧.

١٨- الاسلام والسلامة النفسية، خالد محمد الشهري.

١٩- ابداع الطب النفسي العربي الاسلامى واثره في الاخـرين. عمـر عبيد حسنة.

ئینگلیزی:

20- Oxford hand book of psychiatry. 3rd edition, 2013, David Semple,Roger Smyth.

21- Synopsis of Psychiatry Behavioral Sciences / Clinical Psychiatry. Eleventh edition 2015, Kaplan & Sadock's.

22- Varcarolis' foundation of Psychiatric – Mental health nursing A clinical Approach, 8th edition, 2018, Margaret Jordan Halter.

23- Oxford shorter of psychiatry. 2017, Paul Harrison, Tom Burns, Philip Cowen and Mina Fazel.

24- Oxford Textbook of Correctional Psychiatry. Robert Trestman, Kenneth Appelbaum, Jeffrey Metzner, 2015.

25- Psychiatric Notes for medical students, second edition, Twana A.Rahim, 2015.



26- Psychiatry nursing ,2008, Mary Ann boyd.
27- NMS psychiatry 2000, James H. scrully.
28- Behavioral science in medicine 2004, Barbara Fadem
29- Diagnostic and statistical manual of mental disorders 5 edition, 2013. American Psychiatric association



# "دەروازەیەك بۆ
# نەخۆشییە دەروونییەكان
## و هەندێك لە نەخۆشییەكانی دەمار"



ناخۆشترین رۆژانێک ئەو کاتانەیە کە دینداری دەبێتە پیشە نەک باوەر، مرۆڤ بۆ شتە سادە و بێبایەخەکان ساتە جوانەکانی تەمەنی بە دڵتەگی و بێزاری بەسەر دەبات، نەشارەزایی و بێئاگایی لە ئایین وایلێدەکات لەبری ئەوەی دین ببێتە رووناکی و ئارامی بۆ روح و گیان دەبێتە مایەی سەرلێشێوان و کێشەی دەرونی و کۆمەڵایەتی.

پەشێوی و نەخۆشی دەرونی توشی هەندێک لە تاکەکانی کۆمەڵ نابێت بەڵکو توشی هەمووان دەبێت بەپلەی جیاواز و لەکاتی جیاوازدا بۆیە نابێت ئەمە خەمێکی تاکە کەسی یان کۆمەڵە کەسانێک بێت بەڵکو دەبێت خەمی هەمووان و لە پێشینەی کاری سەرجەم دام و دەزگاکان بێت.

پەیوەندی دینداری بە دەروون دروستییەوە پەیوەندییەکی ئەرێنیە بەڵام هەرکات چەمکی دین و دینداری لەواتا جوانەکەی دابرێنراو چووە قاڵبی بازرگانی و پیشەگەری و سیاسەتەوە ئەم پەیوەندییە مەرج نیە بەو جۆرە ئەرێنیە بمێنێت.

کەسانێک هەن خەون بە تەندروستی و ئارامیەوە دەبین و کەسانێک هەن لەهەوڵی بەردەوامدان بۆ بەدەستهێنانی هەردووکیان، هەوڵبدە لە کۆمەڵەی دووەم بیت چونکە هیچ شتێک لەخۆت بەبەهاترو ناوازەترنیە.

نوسەر

نرخ: ٦٠٠٠ دینار

ISBN: 978-9922-626-57-4





07501269689
07511408868

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاری ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆموڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)